سەرتیپ محەمەد ئەمین

# هەمەوەند لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا

## لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان

٢٠٠٨

هەمەوەند لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا
سەرتیپ محەمەد ئەمین
٢٠٠٨

هەتا جوامێر دەنگی دلێر بوو
تیپی هەمەوەند ژنیشیان شێر بوو

پیرەمێرد

# هەمەوەند
# لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا

سەرتیپ محەمەد ئەمین

٢٠٠٨

* ناوی کتێب: هەمەوەند لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا
* ناوی نووسەر: سەرتیپ محەمەد ئەمین
* تایپ و نەخشەسازی بەرگ : هاوتا سەرتیپ محەمەد ئەمین
* تیراژ : ٥٠٠
* نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم
* شوێنی چاپ : سلێمانی ﴿چاپخانەی کوردستان﴾
* ژمارەی سپاردن : ( ٥١ ) ی ساڵی ٢٠٠٨.ز وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە .

# پێشەكی

هەلومەرجی ڕابوردوو لەم پارچەیەیی كوردستاندا ، بەتایبەت بەر لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ، بەجۆرێكی وا نالەبار و سەخت و ئاڵۆز بوو ، وەك حكومەتی عێراق ڕۆشنبیری كوردیی لەچیرۆك و شیعردا ... كورت كردبوەوە و بەهەموو شێوەیەك تیٔ ئەكۆشا مێژوومان پەردە پۆش بكاو بیشێوێنیٔ ، ڕۆشنبیرانی كوردیش بەگشتی هۆشیاری مێژوو دۆستی و دڵسۆزییان بۆ كەلەپووری شارستانی كورد لەناودا یەكجار كز بوو ، بەڕادەیەك كەلەم مەیدانەدا لانی كەمی ئەركی سەر شانی خۆیان بەجیٔ نەهێنا . شەڕو شۆڕی بەردەوام و نائارامی بارودۆخی سیاسی و كردەوە و سیاسەتی حكومەت ، كارێكیان كرد بەشی هەرەزۆری سامانی بەڵگەنامەی كوردستان لەناو بچیٔ .

بەداخەوە ، وەك دوای ڕاپەڕین چاوەڕوان ئەكرا ، عەقڵیەتی كورد نەگۆڕاو كاری جددی بۆخزمەتی مێژووی كورد نەكرا ، نە ئەرشیفێكی نیشتمانی بۆ كۆكردنەوە و پاراستنی و بەردەست خستنەوەی بەڵگەنامەی كوردی و هی بیانی لەسەر كورد دامەزرێنرا ، نەهەوڵیش درا ، بەتایبەت لەڕێی زانكۆكانی كوردستانەوە ، پسپۆڕ و كادیری چالاك و تێگەیشتوو بۆ ئیش كردن لەبواری مێژوودا پیٔ بگەیەنریٔ .

كارێك كەئەم قۆناغەی ژیانی كورد ئەیخوازیٔ ، هەوڵدانە بۆكۆكردنەوە و بەدەستهێنانی زانیاری و بەڵگەنامە و لێكدان و نووسینەوە و لەچاپدانیان ، تا دواتر ببنە سەرچاوە بۆكاری زانستی . هەر قۆناغ و مەودایەكی مێژوومان بگری ، وەكو پێویست لای لیٔ نەكراوەتەوە و كەلێن و ناتەواوی زۆری تێدا بەدی ئەكریٔ . بۆیە ئەركی ڕۆشنبیرانی كوردە ، هەر یەكە لەناوچەی خۆیەوە ، بكەوێتە كۆكردنەوەی زانیاری و بیرەوەری و بەڵگەنامە و هەرشتێكی تری لەو بابەتە كەكەڵكی بۆ نووسینەوەی مێژووی كورد هەبیٔ .

بەندە ، بەو پێیەی وایەکێکی سەر بەهۆزی هەمەوەندم کەنەخشێکی بەرچاوی لەمێژووی نوێی کوردا هەبووە ، دەرکم بەوە کردووە کەئەوەی تائێستا لەبارەی هەمەوەندەوە نووسراوە ، پێویستی بەماندوێتی و کردە و کۆششی زیاترە بۆ پەیداکردنی زانیاری و بەڵگەنامەی پتری متمانە پێکراو ، تا دیوە ناڕۆشنەکانی ئەو مێژووەیان لێ ڕوون و ساغ بکرێتەوە .

جا لەو ڕووەوە منیش پێم وایە ئەتوانم خزمەتێکی بچووك بەمێژووی هەمەوەند بکەم کەدواجار خزمەتی مێژووی گشتی کوردە ، چەند ساڵێکە لەمەراق و خەمی کۆکردنەوەی بیرەوەری و زانیاری و بەسەر هاتی ئێرە و ئەوێم سەبارەت بەهەمەوەند و پیاوە گەورەکانی .

یەکێك لەناودارەکانی هەمەوەند ((جوامێر ئاغا)) یە کەتا ئێستایش لەناو کورددا بەگشتی و ناو هەمەوەندا بەتایبەتی ناو و باس و خواستی هەیە و بەسەرهات و سەربوردەکانی ئەو ترێنەوە و قسەیان لێ ئەکرێ .

ئەمە وای لێ کردم بکەومە خۆ بۆ کۆکردنەوەی هەر زانیاری و بیرەوەرییەك لەبارەیەوە . بەپێویستیشم زانی کتێبی (فەتحنامەی حسام الملك) کەسەبارەت بەو مێژووەیەو نووسەری بەتوانا دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی بەفارسی لەچاپی داوە و برایان ئەمیر نەژاد و ئاسۆ کردوویانە بە کوردی ، بکەمە پاشکۆی ئەم کتێبە .

ئەوی پێم کراوە ، کەدڵنیام لەکەم و کورتی بەدەر نیین ، ئەوەیە کەلێرەدا خستوومەتە بەرچاوی خوێندەواران . وەك هیوامە ئەم بەرهەمە کەلەبەرێکی ناتەواوییەکانی ئەو مێژووە پڕ بکاتەوە ، هیوادارم هانی ڕۆشنبیرانی تریش بدات بکەونە خۆیان و کار بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم مەیدانە بکەن .

سەرتیپ محەمەد ئەمین

چەمچەماڵ

## کورتەیەك دەربارەی مێژووی هەمەوەند

خێڵـی هەمەوەنـد مێژوویـەکی پڕلـە سـەروەریان هەیـە ، کەچـی تائێـستا مێژووی ئەم خێڵـە پوخـت نـەکراوە و نەخراوەتـە بەردەم خوێنـەر ، ئێمـەش بـەباشمان زانـی بـۆ ئاشـناو شـارەزا بـوون لـەم خێڵـە ، کـەمێك دەربـارەی مێـژووی ئـەم خێڵــەو ناوەکــەی ڕوون بکەینــەوە . ئەمــەش مــشتێکە لــە خەرواریك . مامۆستا عەلاددین سوجادی لە مێـژووی ئـەدەبی کوردیـدا بـەم جۆرە باسـی خێڵـی هەمەوەنـد دەکـات . ئـەم خێڵـە لـە دەورووبـەری سـاڵانی ١٧٠٠.ز لە ناوچەی (سنە)ەوە هـاتوون . پیاوێك کەناوی (خودادادەشـەل ) دەبـێ لـە هەوارگـەی خـۆی تـێ ئەپـەڕێ و بـەناو بـانی زەهـاودا بـۆ بنـاری پێنجوێن دەچێت . لە گوندی هەنگەژاڵـە بۆ لای شێخ ڕەزا دەچێ و دەبێتـە دەروێش ، ماوەیەکی پێناچێ شێخ لە خێڵی (تیلەکۆ) ژنێکی بۆدەهێنێت . خــودادادا لـــەم ژنـــە چـــوار کـــوڕی دەبـــێ ، یادگـــار کـــەپێیان وتـــوە چـەلەبی ، ڕەمـەزان ، ڕەشـید ، سـەفەر . زۆری پـێ ناچـێ ئـەم بەرەبابـە لەگونـدی هەنگـە ژاڵـەوە بـار دەکـەن و دەچـنە دەشـتی بازیـان و شـاری چەمچەماڵ ، بەناوی چەمچەماڵی کۆنە شوێنی خۆیان لەدەوری کرماشان و بێـستون کـە (سـوڵتان ئاواشـیان)پـێ ووتـوە – ئـاوای دەکەنـەوە و تێـی دادەنیـشن . ئەمانــە ووردە ووردە پــەرە ئەسـێنن و هەرچـوار تیرەکــەی هەمەوەنـد ، چـەلەبی (بـەگزادە) ، ڕەمەوەنـد ، ڕەشـەوەند، سـەفەرەوەند دروست دەکەن و ناوو ناوبانگێکی باش لەدەشتی بازیانـدا پەیـدا دەکـەن . ئەفسانەیەك لەناو هەمەوندا هەیە ، کە گوایە لەو سەردەمەدا کە خودادادا لە لای شـێخ ڕەزای هەنگـە ژاڵـە بـووە ، شـەوێك خـەو دەبـینێ کـە لەخەویـدا ئاگرێـك لـە سـەر زەکەریـەوە بڵێـسە دەسـێنێ و بـەر ئەبێتـە ئـەو شـاخ و داخـە ، هەرچەند دەکەن بەکەس ناکوژێتەوە ! بەیانی خەوەکەی بۆ شێخ ڕەزا دەگێڕێتـەوە ، شێخ پێـی ئـەڵێ : لەنەتـەوەی تـۆ خێڵێکـی ئـازاو گـەورە ئەکەوێتەوە ، هەر لەبەر ئەمەش بووە کە ژنێکی تیلە کۆیی بۆ هێناوە .

لەو سەردەمەدا کەخوداداد و کوڕەکانی لە وڵاتی چەمچەماڵ و بازیان ناو بانگێك پەیدا ئەکەن ، یەکێ لە ئامۆزاکانی خوداداد کە (چەم سورخاو)ی ناو دەبێ خۆی و هەرسێ کوڕەکەی (شاوەیس ، کاکەوەیس ، بارام) ئەوانیش لە چەمچەماڵی کرماشانەوەو بار دەکەن و دێن بۆ لای ئەوان ، ماوەیەکی زۆری پێ ناچێ (بارام) یان کچێکی چەلەبی هێناوە کەناوی (خاتون) و خوشکی شەریف هەمەوەند بوو، بارام لەم خاتونە دووکوڕی بووە (عەلی گوڵ خاتون) ، (هەیەر گوڵ خاتون) .

لەشەڕی نێوان تورك و هەمەوندا هەیەر گوڵ خاتون هەر بەگەنجێتی ئەکوژرێو هیچ نەتەوەیەکی لێ بەجێ نامینێ ، عەلی گوڵ خاتونیان نۆ کوڕی بووە ،(عەوڵا ، فەتە ، ئەمین ، سەعە ، ئەحە ، ڕەزا ، سڵە ، بارام ، مەحول). بەجۆرێکی تێکڕایی لەم کوڕانەی خوداداد چەم سەرخاو عەشرەتی هەمەوەندی دەشتی بازیان کەوتۆتەوە . هەرچەندە بەبەرەی چەم سورخاو دەڵێن (سێتەبەسەر) دەبێ ئەمە (سە) تاپسر بێ و بەناوی سێ کوڕەکەیەوە بێت ، بەڵام لە ڕچەڵەکدا سێتەبەسەر هەمەوەندن ، ئەو کەسانە کەسێتەبەسەر بەجاف دادەنێن دوور نییە زۆر چاك لەم باسەیان نەکۆڵیبێتەوە بۆیە وایان ووتووە تیایا بەهەڵە چوون . ئەم عەشرەتە شێوەی قسە کردنیان لە کەڵهوڕ دەکا نەك لەجاف . هەموو پەیڕەوی مەزهەبی شافیعین زۆر بەسۆزیشن تێیدا ، وەکو ئەمەیان هەیە ئەوەشیان هەیە ، کەلێیانەوەو دەگێڕنەوە : کاروانێك ڕووت دەکەنەوە ، دەمە دەمی خۆرئاوایە ، یەکێکیان نوێژی عەسری نەکردووە ئامۆژگاری ئەوانی تر دەکاو دەڵێ : ئێوە سەر ڕێی کاروانەکە بگرن مەهێڵن بڕوا تامن نوێژ دەکەم[1] .

---

[1] عەلاددین سوجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی معاریف – بەغدا ساڵی ١٩٥٢ ز لاپەڕە ٥٤٤-٥٤٥-٥٤٦

مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف لە بارەی خێڵی هەمەوەندەوە ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە ، کەخێڵی بەناوبانگی هەمەوەند بە پێ ی گێڕانەوەی هەندێك لەتەمەن دارانی هەمەوەندی وەك بەڕێز کەریم ئاغای فەتاح ئاغا کەمرۆڤێکی ڕۆشنبیرو مێژوو دۆستەو تا ئێستا سەرۆکیانە ، لقێك بووە لە خێڵی (جەلالی) و لە (وان) ەوە هاتووە . جەلالی خێڵێکی گەورەو شەڕکەری نیشتە جێی ناوچەی (ماکۆ)ی نزیك سنوری ڕووسیاو لەکوردستانی ژێر دەستی ئێراندایە ، بەشێکی تریشیان لەکوردستانی ژێر دەستی تورکیا دەژین . ئەم بەشەی جەلالی چەند سەدساڵێك لەمەو بەر هاتوونەتە ناوچەی چەمچەماڵی کرماشان و ماوەیەکی درێژ خایەن لەوێ ماونەتەوە ، تاکو زارە کرمانجیەکەی گۆڕاوە بەزاری گۆران ، ئینجا لەسەدەی هەژدەیەمدا هاتوونەتە ناوچەی (بازیان و چەمچەماڵ) ی نێوان سلێمانی و کەرکوك لێی نیشتەجێ بوون[٢] .

کلبعلی خانی زەنگنە دەڵێت : ئەمانە پێیان دەووترا بهتۆیی . ئەم خێڵە لەسەردەمی کەریم خانی زەندا یەکێك بوون لەو خێڵانەی کە لەگەڵ کەریم خان بۆ شیراز چوون . پاش ڕووخانی حکومەتی زەند ئەمانیش وەك زۆربەی خێڵە کوردیەکانی تر لەلایەن قاجارییەکانەوە بۆ قەزوێن و مەلایەر و تویسرەکان و گیلان و مازندەران دوور خرانەوە ، بەسەر گوندەکانی ئەو ناوچانە دابەش کران ، تا ئێستاش هەندێکیان لەوێ دەژین و بە زمانی تورکی قسە دەکەن ، بەڵام ئەوانەی کەلەدەور کرماشان مابوونەوە ناوی ئەحمەدەوەندیان پێوە لکێنراو بوونە ئەحمەدەوەند بێتۆیی . ئەمانەش بوونەتە دووبەش ، بەشێکیان پێیان دەووترێت کڵاو سپی یان کڵاو چەرمی ، ئەوی تریان پێیان دەڵێن کڵاو سپی شیرازی ، کەهەمەوەندەکانی بازیان و چەمچەماڵ دەگرێتەوە .

---

[٢] عەبدولرەقیب یوسف ، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی ، سلێمانی ، ساڵی١٩٩٧.ز ، ژمارە ٢٤٦ .

**هەمەوەندەکانی ئێران لەم تیرانە پێکهاتووە:**

١. یارمیرەوەند

٢. دوستمیری

٣. دمصفاوەند

٤. جانی خانی

٥. کڵاو چەرمی(هەمەوەند)[٣]

**هەمەوەندەکانی عێراقیش لەم تیرانەی خوارەوە پێکهاتووە:**

١. بەگزادە(چەلەبی)

ئەم تیرەیە گەلێك پیاوی ناودارییان لە مێژووی هەمەوەندا هەیە لەوانە شەریف چەلەبی ، چەلەبی قەدیمی هەمەوەند کەیەکێك بووە لە دوانزە سوارەی مەریوان ، فەقێ قادر ، کەریم بەگی فەتاح بەگ ، سابیر بەگی کەریم بەگی فەتاح بەگ ، شەریف فەرەنگێز ، رەحیم کاکە عەبدوڵا ئاغا ، محەمەد سلێمان ئاغا ، عارف ئاغا ، حەمە ئەمین ئاغا . هەروەها لە ناودارەکانی بنەماڵەی شەمسە کە ئەمانیش بەگزادەن : حاجی ئەحمەد حوسێن ، فەقێ ڕەسول ، حاجی عەلی عوسمان ، کە لە گوندی نێزێ (نێزە) لە نزیك سەردەشت دادەنیشن ، کە نزیکەی (١٠٠) خێزان دەبن

٢. سەفەرەوەند

لە پیاوە ناسراو و ناودارەکانی : محمود زاری ، محمود خدر ، ئەحمەوە ڕەش، فەتاح چاوسور ، حەمەی حەیدەر ، شامار ، زۆراب وانەك ، جەوهەر ئاغا ، فەتاح حەمە ڕەزا ، قادر حەمە ئاغا ، کاکەوڵا خدر ، عەزیز شامار .

٣. ڕەمەوەند

لە پیاوە ناودارەکانی تیرەی ڕەمەوەند : ڕەشید ئاغا ، ئەمین ئاغا ، کەریم سور ، حەسەن ڕۆستەم ، حسن سلیمان ، فەتاح بارام ، عەزیز حەیدەر .

---

[٣] حەیدەر بهتۆیی ، کورد و پراگندگی او در گسترده ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ هەتاوی ، لاپەڕە ٢٣٣ .

**٤. بابلەوەند**

**ناودارەکانی ئەم تیرەش بریتین لە : ڕەشید فارس خاتوون ، چەتۆ فارس ، ئەحمەد بابل ، ناکە قادر ، عەلی مەحموود یاسم[٤] ، کەریم پیرە .**

---

[٤] عەلی محموود یاسم ئەوکاتەی لە گوندی تەژگا دەژیا ، لەگەڵ سەرۆکێکی هەمەوەند نێوانیان تێکدەچێت . بەخۆیی و بنەماڵەکەیەوە لە زێی بچووك دەپەڕنەوە و بەرەو لای حەمەئاغای کۆیە دەچن . حەمەئاغا پێشوازییەکی گەرمیان لێدەکاو عەلی دەکا بە سەرپەرشتیاری هەرسێ گوندی (خەرابە ، شیواشۆك ، گردە سور) و پێی ئەڵێ: لە ئەمڕۆ بەدواوە تۆ بویتە عەلی ئاغا ، خەڵکی دەبێ بە عەلی ئاغا بانگت بکەن . ئەویش ماوەی بیست ساڵ موڵکانەی ئەو سێ گوندەی بۆخۆیی و حەمە ئاغا کۆدەکردەوە ، پاشان لە حەمە ئاغا هەڵدەگەڕێتەوەو هیچ حیسابێکی بۆ ناکات . داپیرەیەکی دەبێ دەڵێ : عەلی ئاغا ، عەلی ئاغا هەس ، حەمە ئاغا چەس .

لەمەوە کێشە دەکەوێتە نێوانیان ، حەمە ئاغا کەدەزانێ بەرامبەر بە عەلی ئاغا هیچی پێ ناکرێ ، بۆیە ناچار دەبێ داوای یارمەتی لە خێڵێ شێخ بزێنی بکات ، کە هاوکاری بکەن بۆ دەرکردنی عەلی ئاغا . حەمە ئاغا خۆیی و پانزە سوارەی تفەنگ بەدەست بەرەو لای عەلی ئاغا هاتن لە دوورەوە وەستاو سوارێکی نارد بۆلای عەلی ئاغا ، کە پێی بلێ ، حەمە ئاغا دێت بۆلات بۆ میوانی وڵات وڵاتی خۆتە . ئیتر لەمەو دوا زەکات مەدەو تۆش ئاغایەکی وەك من . کاتێك حەمە ئاغا هات بۆ لای عەلی ئاغای هەمەوەند ، تفەنگەکانیان سەرەوخوار کردبوو کە خۆیان وا نیشان ئەدا بۆ شەڕ نەهاتوون . پاش سێ ڕۆژ خزمەت کردن و میوان داری ، ئیتر عەلی ئاغا و کوڕەکانی دڵنیا بوون و خۆیان کردەوە ، زینی ئەسپەکانیان کردەوەو تفەنگەکانیان خرانەوە قەد دار . پیاوەکانی حەمە ئاغا فرسەتیان هێناو لە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆدا هەر چوار کوڕەکەی عەلی ئاغا بەناوی (مارف ، کاوێز ، ئەحمەد ، محەمەد) دەکوژن و خۆیشی بەدیل دەگرن . پاش قۆڵبەست کردنی عەلی ئاغا لە ڕێگای شیوە سور و تەق تەقەوە بە سواری وڵاغێك و چەند پاسەوانێك ڕەوانەی کەرکوکی دەکەن ماوەی دەساڵ لە کەرکوك حوکم دەرێت . پاش بەربوونی دەگەڕێتەوە گوندی تەژگا . لە کتێبەکەی حەمە ئاغای گەورەی کۆیە ، کە لەلایەن مەسعود محەمەدەوە نووسراوە لە لاپەڕە ٤٩ دا هاتووە بۆ بەرگری کردن لە دەست درێژی هەمەوەندەکان ، حەمە ئاغا دۆستایەتی لەگەڵ خێڵی شێخ بزێنی گرت بۆ پاش گەز بوونەوەی هەمەوەند . لە تۆڵەی کوژرانی عەلی ئاغا ، هەمەوەند چەند جار لەشکر کێشی دەکەنە سەر حەمە ئاغا و شێخ بزێنی ، شەڕو کوشتاری زۆر لەنێوانیاندا ڕوویداوە ، تا ئەوکاتەی لە ساڵی ١٣١٦ی کۆچی ڕێکەوتننامەی نێوان هەمەوەند و شێخ بزێنی مۆر کرا .

ئەم زانیاریەم لە (قاسم کەریم تۆفیق عەلی مەحموود یاسم) بابلەوەندەوە وەر گرتووە .

**٥. ڕەشەوەند**

**لـە پیـاوە ناسـراوەکانی تـیرەی ڕەشـەوەند : حەسـەن حوسـێن ، محمـود حـسین ، کاکـەوڵا ئەفەنـدی ، فـەقێ محمـد ، محمـود ئەفەنـدی ، کـەریم کەیانی ، حەسەن سلێمان ، کاکەمەند محەمەد ، مارف کەیانی .**

**٦. هەمەیل**

**لـە پیـاوە ناودارەکـانی : حەمـە ئـەمین قـادر نـادر ، عـەلی سـور ، حەسـەن نادر ، مەحموود نادر (خوله هاره) ، حەسەن فەتاح .**

**٧. قوڕکەوەند**

**ئـەم تیرەیـەش گـەلێك نـاودار و ڕیـش سـپییان هـەبووە وەکـو : عـەلی قوڕکەوەند ، کەریم ڕەش هەروەها فەرەیدون کەریم ڕەش ، عەبدولقادر .**

**٨. سۆفیەوەند**

**ئـەم تیرەیـەش گـەلێك نـاودار و ناسـراویان هـەبووە لەوانـەش : ڕەحـیم ئـالی بەگ ، عەزیز عەلی ، خەلیفە ، موراد ڕەسوڵ ، ئەحمەد مستەفا عـەلی ناسـراو بە ئەحمەد ڕەنان ، کوێخا محەمەد ، مستەفا قادر ، محەمەد حەسەن ڕەزا .**

**٩. بێتیارەوەند**

**لە پیاوە ناودارەکانی هەمەوەند کە سەربە تیرەی بێتیارەوەندە :**

*** عزیز سلێمان براگەورەی تیرەی بێتیارەوەند بووە .**

*** کـریم براخـاس و حکـیم سفر ئـەم دوو پیـاوە سـەر بـەتیرەی بێتیـارەوەنن لە سنوری کەلار لە گوندی حەوش کوڕی .**

*** مەردان قاسم باوکی فەرمان ئاغای بێتیارەوەند کەئێستا خـاوەنی ئـاوایی وەروانن لـە سنوری خانـەقین لەگـەڵ خزمەکانیـدا ، هـەروەها کوێخـا زەینـەڵ موالی ئەویش لە خانەقین بوو .**

*** کریم عزیز : ڕیش سپی تیرەی بێتیارەوەند هەروەها حاجی سابیر محمد قادر ناسراوە بە حاجی سابیر ڵاڵ پیاوێکی ناودار بووە .**

* حەمە چەچان عەزیز بێتیارەوەند لەساڵی ١٩١٩.ز لەگەڵ حەمەرەشید جوامێر دا بەشداری شۆڕشەکەی شێخ مەحموودیان کردووە هەردووکیان لە شەڕەکەی دەربەند بازیان شەهید بوون .
* فەتاح ڕەسوڵ .
١٠. میتمەوەند
ئەم تیرەیەش گەلێك پیاوی جەربەزەو سوار چاك و ناوداریان هەبووە لەوانە : کاکە ڕەش گوڵە ، ئەلیاس خان ، ئەحمەد سەلیم ، ئەحمەد حەمە خەسرەو ، حەمە عەلی غوڵام .
١١. سێتەبەسەر
ئەم تیرەیەش گەلێك پیاوی ئازاو سوار چاك و ناوداریان هەبووە لەوانە : ساڵەح ڕێحان ، عزیز کاکی حەمەی زۆراب ، شاکر فەتاح ، ئەمەش ناودارەکانی کەلارن : حاجی کەریم غفور نجاڕ ، سالم سلیمان زەینەل ، ڕەحیم قارەمان ، عەزیز ڕەشید سڵێمان ، محێدین ڕەشید سڵێمان ، حاجی ڕۆستەم محەمەد غەفور .
١٢. کەلەوەند
لەناودارەکانی تیرەی کەلەوەند شێخ مورشد لەگەڵ فەهد تیرەی کەلەوەند شوێنی دانیشتنیان گوندی بەشیر و قەزای توز خورماتووە ، ئەم تیرەیە بە تورکمانی قسەدەکەن و شیعە مەزهەبن . هەمەوەندەکانی سنوری کرماشانیش هەموویان شیعە مەزهەبن .
١٣. بنەماڵەی جوامێر ئاغای ڕەگینە
جوامێر ئاغا و زوڵاڵ ئاغا کەبرا بوون هەردووکیان لەدوانزەسوارەی مەریوان بوون هەموو سەرچاوەکان ناویان دەبەن .
لەسەر هۆز و ڕەچەڵەکی جوامێر ئاغا هەندێك بۆچوونی جیاواز هەبوو هەندێك دەڵێن بابانەو وەهەندێکی تریش دەڵێن هەمەوەند و لە بنەماڵەی ئەحمەدەوەند لە ئێران . مامۆستای مێژوو نووس جمال بابان لە گۆڤاری

کاروان ژماره ۲۷ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۸٤ نووسینێکی دەربارەی مێژووی هەمەوەند نووسیوە و دەڵێت : جوامێر ئاغا هەمەوەندە و هەندێك لە ڕیش سپیان و زانایانی بنەماڵەش لەسەر ئەم بیروڕای مامۆستا جەمال بابانن . نەقیب عەبدوڵا دەڵێ : ئێمەش خۆمان لەباوو باپیرانمان بیستووە کەهەمەوەندین لە تیرەی بەختیاری دوایی بووە بە بەهتیاری دواتر گۆڕاوە بووە بەبهتۆیی[٥] .

## وشەی هەمەوەند لەچییەوە هاتووە

مامۆستا عەلاددین سوجادی لەم بارەوە دەڵێت : هەندێك دەڵێن ئەمە (ئەحمەدەوەند) ەوکراوە بە هەمەوەند و گوایە نەتەوەی ئەو (ئەحمەد) ناوەن و (وەند) یش بەمانای زادەیە ، ئەمەش لەگەڵ باوەڕی من پێچەوانەیە ، چونکە من لام وایە ئەم ووشەیە ئاشنایەتی بە (ئەحمەدەوەند) نییە ، بەڵکو ئەمە لەسەر ئەو شێوەیە کەبە هەمەوەند دەڵێن هماوەند . ئەسڵەکەی (هوما – وەند) هوما مەلێکی بەنگینە ، (وەند) یش لەپەهلەوی کۆندا بەمانای (خاوەن) دێت ، هوما لەسەر زار بووە بە (هەما)، ئینجا هەماوەند – هەمەوند – هەمەون . وەیا هەر ڕاستەو ڕاست (هەمەوەن) . (هەمە) بەمانا هەموو (وەند) یش لە پەهلەویدا بەمانا ( وەکو) واتە هەموو وەکو یەکن ، ئینجا موناسیبە لەگەڵ عەشرەتەکەدا لەسەر هەردوو ماناکەدا : یەکەمیان : دەبێ باپیرە هەرەگەورەی ئەمانە خۆی لەخۆیەوە کتوو پڕ هەڵکەوتبێ و ناوی دەر کردبێ بەجۆرێکی وا خەڵکی لێی سەرسام بووبن ، ووتبیان ئەمەچییە وا زوو بەرز بووە وە ؟ یەکێك لە وڵامدا وتبێتی: بابە ! هوماوەندە ، واتەخاوەن هوما و نەگینە ئیتر ئەوناوە بەسەر خۆی و نەتەوەکەیدا بڕابێ .

---

[٥] نەقیب عەبدوڵا ، جوامێر ئاغای ڕەنگینە ، سلێمانی، ساڵی ۲۰۰٤.ز ، لاپەڕە ٦ .

دووەم : یەکێك لەوەختی خۆیا چاوی بەهەندێك لەمانە کەوتبێت هەموو لەیەك چووبن ، مەبەستەکەی خۆی بۆ جیا نەکرابێتەوە ! کەلێیان پرسیوە وتویەتی (هەمەون) واتە هەموو وەك یەك[٦] . (ئۆ . ل . ڤیلچێڤسکی ) لە بارەی ووشەی هەمەوەند دەڵێ : بۆ دەست نیشان کردنی پاشگری (وەند) ناوی ئەم خێڵەی پێ تەواو دەبێ ، سۆفیکسێکی کۆن و ئاسایی ناوی خێڵەتی کورد و لوڕ و خێڵە ئێرانیەکانی ترە . زاراوە (هەما) ی بەم پاشگرە کۆتایی دێت ناوێکی ناوچەیی باڵداری ئەفسانەیی (هۆما) یە کە بەختەوەری دەبەخشێ ، ئەم باڵدارە هەمیشە نیشانەی دەسەڵاتی شاهانەیە و هەروەها مانای (هەڵۆی گەورە) ش دەدات ، بۆیە لەناو خێڵی هەماوەندا پەرستنی هەڵۆ ، بەسیما ئێرانیەکەیەوە بە ئاشکرا دیارە[٧] .

## شەریف چەلەبی

دوا بەدوای ساڵی ١٢٥٢ ی کۆچی و لە ناوچوونی ئەمارەتەکەی بابان بەدەستی عوسمانییە خوێن خۆرەکان لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەوڕەحمان پاشادا ، لاوێکی هەڵکەوتوو لە هۆزی هەمەوەندی چەلەبییەکان پەیدا بوو بەناوی (حەمە شەریف) و ناوبانگی بە (شەریف ڕەندان) دەر کردبوو ، ئەم شەریف ڕەندانە هەوای فەرمانڕەوایی ئەمارەتی بابانی سولەیمانی کەوتە کەلەوە داوای لە عوسمانییەکان کرد سولەیمانی بۆ چۆڵ بکەن . عوسمانییەکان بەم داواکارییە ڕازی نەبوون و خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کرد . شەریف ڕەندان بە لەشکرێکی دوو هەزار سوارەوە هەڵی کوتایە سەر سولەیمانی شەڕ و کوشتار بەتوندی ماوەی چەند هەفتەیەك درێژەی

---

[٦] عەلاددین سوجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی معاریف – بەغدا ، ساڵی ١٩٥٢.ز لاپەڕە ٥٤٧-٥٤٨ .

[٧] ئۆ . ل . ڤیلچێڤسکی ، ڕەشاد میران لە ڕووسییەوە کردویەتی بە کوردی کتێبی نەژادی کورد و ڕەووتی مێژوویی دروست بوونی میللەتی کورد ، هەولێر ، چاپی دووەم ، ساڵی ٢٠٠٠.ز لاپەڕە ١٨٨ .

خایانـد . دوای ماوەیـەك شـەریف سـەر و ڕیـشی زۆر هـاتبوو نـاردی سەرتاشێکیان هێنا و شەریف ڕووی کردە سەرتاشەکە و پێی گوت : کاکی سەرتاش ، سەر و ڕیشم باش بتاشە چونکە بەیانی ئەم سەرە یا ئەبێ لە کۆشکی شاهیدا پادشا بێت ، یاخود بەنووکی ڕمەوە دەیبینی .
بۆ ڕۆژی دواتر هەردوو لەشکری هەمەوەند و عوسمانی لە نێوان گوندی قڕگە و گردی سەیواندا تێکەڵ بوون و شەڕ گرمەی تێکەوت لاشەی کورد و عوسمانی بەسەر یەکدا کەوت لەو کاتەدا بەئەمری یەزدان گوللەیەکی وێڵی شەش خان بەر سەری شەریف کەوت و شەریف کوژرا ، کاتێ لەشکری شەریف بەسەرهاتەکەیان زانی ، دەستیان لەشەڕ هەڵگرت و بە کوژرانی شەریف شەڕەکە دوایی پێهێنرا . کوژرانی ئەم لاوە هەڵکەوتووە لە هەموو وڵاتی بابانـدا بـووە مایـەی دەرد و داخ و ڕەش پۆشـو سـوگەواری بـوو لەهەمووو دێهات و کۆڕ و کۆمەڵێکدا شیوەن و چەمەرانەیان بۆ ئە گێڕا[٨] .

## هەمەوەند هەمیشە پاڵپشت و یارمەتی دەری بابانەکان بوون

نـاو دەرکردنـی هەمەوەنـد هەرتـەنها لـەڕووی عەشـایەرییەوە نـەبوو بـەس ، بـەڵکو لـەڕووی ڕامیـاری و کۆمەڵایـەتی و ئابووریـشەوە دەورێکـی باشیان بینی، ئەمەجگە لە سوار چاکی و تفەنگ چێتی و ئازایەتیان نەك هـەر لەکوردسـتاندا، بـەڵکو لـەدەرەوەش دەنگـی دابـووە ، هەمەوەنـد نیشتمانی خۆیان خۆش ویستووە و پارێزگاریان لێ کردووە بە گیان و ماڵ خۆیـان فیـدا کـردووە ، دەسـتی یارمـەتییان بـۆ کاربەدەسـتانی کـورد درێـژ کردووە ، ئەوانەی کە نیشتمانیان لە دەست درێژی دوژمن پاراستووە .

---

[٨] محەمەد ئەمین زەکی بەگ ، مێژووی وڵاتی سلێمانی و دەووروبەری ، چاپخانەی نەجاح بەغدا ، ساڵی ١٩٣٩.ز .

هەمەوەند لە کاتی فەرمان ڕەوایی باباندا ، هیچ کاتێك درێغییان لەچەك هەڵگرتن نە کردووە ، شان بەشانی سوپا و لەشکری کورد دژی دوژمن جەنگاون[٩] ، ئەوەتا لە ساڵی ١٧٨٧.ز دا یارمەتی میری قەڵا چۆلانیان داوە دژی والی عوسمانی لە بەغدا . هەروەها لە ساڵی ١٨١٩.ز یشدا یارمەتی عەبولرەحمان پاشای بابانیان داوە دژی نەجیب پاشای والی بەغدا . لەساڵی١٨٣٤.ز یشدا یارمەتی ئەحمەد پاشایان داوە کە دوا میری بابان بووە ، لە ساڵی ١٨٣٦.ز یشدا لەژێر سەرکردەیی عەزیز بەگی باباندا دژی عوسمانیەکان جەنگاون .

پاش شکانی ئەم عەزیز بەگە هەمەوەندیش بڵاوەیان لێکرد، بەڵام ناوە ناوە لەگەڵ عوسمانیەکان دەستەو یەخە وەستاون ، تالە ئەنجامی ئەم لێك هەڵپرژانانە و تەنگ پێ هەڵچنینیان دا لە لایە عوسمانیەکانەوە چوونەتە ناوچەی زەهاو و حەوت ساڵێك لەوێ ماونەتەوە[١٠] .

شەڕوو بەرەنگاری هەمەوەند لەلایەن جوامێرەوە دژی عوسمانی و قاجاریەکان بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی لە ساڵی ١٨٨١.ز ،کرایە حاکمی قەسری شیرین و ناوچەی زەهاو .

هەمەوەندەکانی وڵاتی عوسمانیش هەمیشە لە شەڕوو ڕوو بەڕوو بوونەوەی جەندرمەکانی عوسمانی بوون ، ئەم حاڵەتە درێژەی کێشا تا لەلایەن هەردوو وڵاتی ئێران و عوسمانییەوە بەپێ ی پیلانێکی دوولایەنە توانرا بەفێڵ و تەڵەکە بازی لە ساڵی ١٨٨٦.ز دا لە قەسری شیرین جوامێر بکوژن و خێڵەکەشی بەرەو وڵاتی شام و تورکیا و تەرابلوسی غەرب و دورگەکانی سلانیك و ڕۆدس نەفی بکەن دورخستنەوەکەش لەم بەڵگەنامەوە دەردەکەوێت : برووسکەی مەئموری ئیسلاحات بۆ ئیسماعیل

---

[٩] جەمال بابان ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ئاوڕێك لە مێژووی هەمەوەند ، بەغدا ، حوزەیرانی ساڵی١٩٨٧.ز ، ژمارە ١١٤ .

[١٠] مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عەبدولکەریم ، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ، لە چاپ کراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٠.ز .

حەقی بۆ سەدری ئەعزەم ڕۆژی نووسین لە (١٤) ی تەموزی ساڵی ١٣٠٣ ی ڕۆمـــی ١٨٨٦.ز ، دایـــەو بـــەژمارەی (٤٧٧) ی ڕۆژی (١٥) ی تـــەموز لەکەرکوکـەوە نێـردراوەو داوای تێـدا کـردووە هەمەوەنـدەکان بـۆ ئـەنادۆڵ دوور بخرێنەوە .

برووسکەکە گوتوویـە : هەمەوەنـدەکان بەڕەزامەنـدی سوڵتان عەبدولحەمیـد بۆموسـڵ و مـاردین و هـەکاری دوور خرانـەوە ، بـەڵام پـاش ئـەوەی کـاری خراپیـان لێ وەشـایەوە ، کەلەوانەیـە زەوت کـردن و تاڵـان کـاری بـێ ، لـەو ناوچانە هـەڵهاتن ، بۆیـە ئیـسماعیل پێـشنیاری کـردووە بـۆ ئـەنادۆڵ دوور بخرێنـەوە ، دوور خرانەوەیـشیان بـۆ ئـەو ناوچانـەی نـاوبران ، کـەم و زۆر پێش ڕۆژی (٣) ی حوزەیرانی هەمان ساڵ بووە ، باس لەوە دەکات دەڵـێ : (١٤٤) خێزانی هەمەوەندم بۆ موسڵ و (٣٣) خێزانم بۆ ماردین (٤٦) خێـزان بۆ هەکاری ، دوور خستنەوەی هەمەوەندەکان بۆ ئەفریقا لێرەوە دەست پـێ دەکات خەڵکی شاری موسـڵ ڕۆژی (١٩) ی شـەوالی ١٣٠٤ی کۆچـی لـە(٢٧) حوزەیرانی‌ــساڵی ١٨٨٦.ز مەزبەتەیــەکیان ئاراســتەی (صـــدر الاعظــم) کـردووە ، داوای دوورخـستنەوەی هەمەوەنـدیان کـردووە بـۆ دوورگـەکانی (جەئیر) دوور بۆتەرابلوسی ڕۆژ ئاوا لەوڵاتی لیبیای ئێستا.

ئیمـام و موختـاری (٣٤) گـەڕەك ئیمزایـان کـردووە مـۆری (٩٩) کـەس بەمەزبەتەکەوەیە . ئەمەش ناوی گەڕەکەکانی شاری موسڵن :

( جـامع جمـشید- بـاب النبـی - میـدان - حـوش الخـان - بـاب الـسرای - سنوسـه - جاموسـیه - جـامع الکـبیر - امـام ابـراهیم - رأس الکـور - سـراجخانه - مکـاوی - بـاب المـسجد - حمـام - جـامع رابعـه - جـولاق - عمـو الـشمال - سـوق الـصغیر- میاسـه - محمـود بـن دراج - منـصوریه - چهار سوق - امام عون الدین - باب الجدیـد - بـاب البـیض - مشاهده - شیخ فتحی - جامع - شیخ ابو علی)

بەپێی بەڵگەنامەیەکی تریش کە ژمارەکەی (٣١) ە لەساڵی ١٨٨٦.ز دا بۆ (صدر الاعظم) بەرز کراوەتەوە هاتووە کە : (( نیشتەجیٚ کردنی هەمەوەند لە موسڵ زیانی لە دانیشتوان داوە ، سزادانی چەتەکان شتێکی پێویستە بەشێکی چەتەکان لە ویلایەتی ئێمەدان ، کەسنوری تا ماردین درێژ دەبێتەوە و بەشێکی تریشیان لەناو سەنتەری ویلایەتەکە نیشتەجیٚ کراوەن . تێکەڵ بوونی ڕۆڵەکانی ئەوان بە ڕۆڵەکانی ئێمە مایەی زیانە بۆ ئێمە ، ئەوانەش کە هەشت ڕۆژ لێمانەوە دوورن زیانیان بۆ گوندەکان هەبووە لەم ڕووەوە گیر و گرفتی بەربڵاو پەیدا بووە .
لەم سۆنگەیەوە هەژارەکان دەربەدەر تر بوون و خەڵکی چاویان لە دەستی ئێوەیە بۆ دوور خستنەوەی ئەمانە چی بۆ تەرابلوس چی بۆ شوێنێکی تر. ئێمەش چاوەڕێی فەرمانی جەنابی سوڵتانین )) .

١٩ ی شەوالی ١٣٠٤ ی کۆچی

١٣٠٣/٦/٢٧ ی ڕۆمی کەبەرامکبەر نساڵی ١٨٨٦ ی زاینییە

ئیمزا : نوێنەرانی موسڵ ئیمام و موختارەکان

*   *   *

سوڵتان عەبدولحەمید نیازی وابووە هەمەوەندە گیراوەکان بکا بە پاسەوانی تایبەتی خۆی ، چونکە خۆشی پیاوی ڕەشید و ئازای خۆشەویست ، بەڵام ئەم ئاوات و نیازەی نەهاتە دی ، چونکە تەتەر و پەیامبەر و نوێنەری وڵاتە ئەوروپاییەکان ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر ئەم نیازەی سوڵتان دەربڕیوە و مەترسی خۆیان نیشان داوە . گوایە نیشتەجیٚ بوون و جێگیر بوونی چەند هەزار چەتە و ڕێگری دەست ڕەش وەك ئەمانە لەم شارەدا ئەوەندەی تر نائەمینی و نائاسایشی شاری ئەستەمبوڵ و ناوچەکە پتر دەکات .
ئیتر ئەوەبوو سوڵتان عەبدولحەمید لەم نیازەی پاشگەز بۆتەوە و گیراوەکانی ڕەوانەی تەرابلوسی ئەفریقا کردووە . هەر لەسەرتاوە لە ئەنجامی نارێك و پێکی ئێشك گرتن و بەهۆی کەم تەرخەمی

پاسەوانەکانەوە زۆربەی زۆری خەڵکە گیراوەکان توانیویانە خۆیان بدزنەوە و تەرابلوس بەجێ بهێڵن و بگەڕێنەوە وڵات و سەر جێگا و ڕێگای جارانی خۆیان . دوای دوو ساڵ زۆربەی هەرە زۆریان توانیویانە جارێکی تر یەك بگرنەوە و لەناوچەکەی جارانی خۆیان جێگیر ببنەوە[11] .

یەکێ لە چیرۆکەکانی ئاوارە بوونی ئەو هەمەوەندانە ئەوەیە کە یەکێکیان ٢٠٠ لیرەی مەجیدیی لەبەریدی ئەسکەندەرۆنە ڕفاند و لەسەر ئەم دزی کردنە حوکم دراو زیندانی کرا بەڵام دواتر خەندەقی لێداو لە زیندان ڕای کرد و پاشان پەیوەندی بە برایم پاشای میللیەوە کرد .

پاش پەسەند کردنی ئەم مەزبەتەیە زۆربەی خێڵی هەمەوەند بەژن و منداڵەوە بۆ تەرابلوسی ڕۆژئاوا (لیبیا) دوور خرانەوە ، دوای زیاتر لە هەشت ساڵ توانیان بەدزییەوە ڕابکەن و دووری (٣٥٠٠)کم ببڕن بگەنەوە وڵاتی خۆیان ( لەو هەمەوەندانەی کەنەفی کرابوون هەندێکیان لە وڵاتی لوبنان جێگیر بوون ، ئەوەتا ئەحمەد تاجەدین باس لەو هەمەوەندانە دەکات کەلە بەگەکانن لە (طاريا و الهرمل) لە بەعلەبەك لە وڵاتی لوبنان دادەنیشن)[12] . ئێستا ئەو قسەیە لەناو هەمەوەند باوە کەبەڕۆژ خۆیان شاردۆتەوە بەشەویش بەڕێ کەوتوون .

حەمەعەلی غوڵام کەپیاوێکی هەمەوەندی زیرەك و ئەستێرە ناس بووە ، بەهۆی هەندێك ئەستێرەی ئاسمانەوە ئاراستەی ڕێگای لەو بیابانەدا ڕاست کردۆتەوە[13] . لە ساڵی١٨٩٦.ز ئەوانەیان کە بۆ تەرابلوس نەفی کرابوون دەرچوون و گەیشتنەوە بازیان . (دکسن) لەبارەی گەڕانەوەی هەمەوەند لە تەرابلوسی ڕۆژئاواوە بۆ وڵاتی خۆیان بەم جۆرە

---

[11] بارۆن ئیدوارد نۆلد (وەرگێڕانی دکتۆر حەمید عەزیز) گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ١١.

[12] أحمدتاج الدين ، الأكراد تاريخ شعب و قضية وطن ، القاهرة ، سنة ٢٠٠١ م ، ص ٤٢ .

[13] سرتیپ هەمەوەندی ، گۆڤاری کەرکوك ، دوور خستنەوەی هەمەوەند بۆ ئەفریقا ، کەرکوك ساڵی ٢٠٠٦.ز ، ژمارە ٢٧ .

دەڵێ : هەمەوەند لە گەڕانەوەیاندا فێڵێکی سەیریان بەکارهێنا بەوەدا کە تورکەکان هەستیان پێ نەکەن بەرگی خۆیان فڕێداو جلی عەرەبیان لەبەر کرد . هەرچی وڵاغێکیشیان هەبوو فرۆشتیان و ماینی عەرەبیان پێ کڕی ، بەئەرکێکی زۆروو دان بەخۆداگرتن گەیشتنەوە دایکی نیشتمان . پاش چەند مانگێك لەدوور خراوەکانی (ئەدەنە) یشیان (١٥٠) سوارێك بەسەڵتە زەلامی ڕایان کردوو گەیشتنە بازیان ، پاشان چوار سەد سوارێکیان خڕ کردەوە چونە دەوری موسڵ و هەڕشەیان لە عوسمانیەکان کرد ، ئەگەر ماڵ و منداڵەکانیان لە (ئەدەنە) نەنێرنەوە بۆیان ، ئەوا ئەو ناوە وێران دەکەن حکومەتیش بە ناچاری داخوازییەکانی بۆ جێ بەجێ کردن[١٤]، دوای نەمانی عوسمانیەکان و داگیر کردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە ، ڕووبەڕووی ئەمانیش بوونەتەوە ، چی وەك پاڵپشتی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود و یان سەربەخۆی خۆیان دژی داگیر کەری ئینگلیز جەنگاون .

## ڕۆڵی هەمەوەند لە نێوان ساڵی ١٨٩٠-١٨٩١

لە ساڵی ١٨٩٠.ز-١٨٩١.ز لەلایەن هەمەوەندەکانەوە هەموو ڕێگا و بانی ئەم ناوچەیە گیراون و ئەو کاروان و پۆستەیەی دوو هەفتە جارێك لە بەغداوە هاتووە ، ئەبوایە ١٢٠٠ جەندرمە بیپارێزن ، بەڵام ئەمەش هەتا سەر سەری نەگرتووە ، چونکە هەمەوەندەکان سێ جار ئەم کاروان و پۆستەشیان شکاندە و دەستیان بەسەردا گرتووە . بێگومان لە بارودۆخێکی ئاوادا ئەم کارانە شتێکی نائاسایی نین . دیسانەوە تورك لەشکری کردۆتەوە و بەسەر کردایەتی مارشاڵ هیدایەت پاشا ، شەڕی خوێناوی لەگەڵ هەمەوەندەکاندا کردۆتەوە .. جێگای داخە ئەم مارشاڵە

---

[١٤] مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عەبدولکەریم ، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ، لە چاپ کراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٠.ز .

لەم دواییەدا مردووە . دوای ئەم شەڕە کراوە بە فەرماندەی گشتی هەردوو ناوچەی بەسرە و حەسەسا . بێ پسانەوە و یەك لەدوای یەك شەڕی سەخت لەگەڵ ئەم خێڵە سەرسەختە ڕێگرە بە چۆکا نەهاتووە کراوە . ئەم خێڵە بۆتە مایەی پەستی و ناڕەحەتی سوڵتان . خۆئەگەر هەمەوەندەکان لە شەڕدا تینیان بۆ هاتبێ ئەوا ناو بەناو سنوری ئێرانیان بەزانووە و خۆیان کردووە بەو دیودا ، یاخود بەرەو دیجلەی چۆڵی میسۆ پۆتامیا هەڵهاتوون و لە لای خێڵی کۆچەری شەممەری دۆستیان پەناو حەشار دراون ، ماوەیەك لەوێ پشوویان داوە و ئینجا سەر لەنۆێ خۆیان چەکدار کردۆتەوە و هاتوونەتەوە مەیدان و بەگژ لەشکری عوسمانیدا چوونەتەوە و شەڕیان لەگەڵدا کردووە . دوا جار هەمەوەندەکان شکاوون و پەکیان کەوتووە ، بەتایبەتی لەدوا شەڕی باکوری نشێوی حەمریندا کەلەشکری عوسمانی بەسەرکردایەتی هیدایت پاشا بووە . وەك هیدایەت پاشا خۆی بۆی گێڕاوەوە لە شکری تورك لە دووهەزار چەکدار پێکهاتووە ، هەمەوەندیش تەنیا چوار سەد چەکداری هەبووە و شەڕەکەیان دۆڕاندووە . ئەوانەی نەکوژراون وتووێژیان لەگەڵ هیدایەت پاشادا کردووە ، ئەویش گفتی پێداون بیان بەخشێت . ئەم تورکە لەو باروودۆخە ناهەموارەدا دوژمنەکانی دوێنێی خۆی بەخشیوە و لێی بووردوون و بگرە چەکیشی نەکردوون و هەر بەچەکداری وەك جاران ماونەتەوە ، ئیتر بۆیە باروودۆخی پێش شەڕەکە جارێکی تر بالی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوەتەوە. سەرەڕای گلەیی و سەرزەنشت و ناڕەزایی فەرماندەکانی بەغدا و موسڵ ئەم بڕیار و لێبوردنە گشتیەی هیدایەت پاشا لە ئەستەمبوڵ پەسەند کراوە . لەدوایدا هەندێك لەسەرکردەکانی هەمەوەندەکان کراون بە فەرماندە و سەرۆك جەندرمە ئەوانەیش کەنەیان ویستووە وەزیفەیان بدرێتێ و هیچ خێر و خۆشییەکیان لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانە نەدیوە لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە موچەی خانەنشینییان بۆ بڕاوەتەوە بۆ ئەوەی جارێکی

تـــر دوژمنايـــەتی ســـوڵتان نەكەنـــەوە و هەربەدۆســـتی دەوڵـــەتی تـــورك بمێننـــەوەو ، هـــەروەها ڕوتبـــە و خـــەڵات و نيـــشانەيان پـــێ بەخـــشراوە . تـــەنيا ئـــەو تاقمـــەی هەمەوەنـــد دووچـــاری نەهامـــەتی و كـــوێرەوەری بـــوون كەنەيان ويستبوو ياخود بەهۆی وريايی لەمەو لای پاسەوانەكانەوە نەيان توانيوە تەرابلوس بەجێ بهێڵن و بگەڕێنەوە سەر ڕێگا و جێگای خۆيان . ئەوەی ڕاست بێ ئەو تاقمە خەڵكەی لە تەرابلوس مابوونەوە هيچی تر لەدەوڵـــــەت يـــــاخی نـــــەبووبوون و لـــــەو شـــــەڕە خوێناوييـــــەی دووەميشدا ، كەباسمان كرد ، بەشدار نەبووبوون . كەچی كار بەدەستانی دەوڵـــەت هـــيچ حـــسابێكيان بۆئـــەم هەڵوێـــستەی ئـــەو تاقمـــە هەمەوەنـــدە نـــەكردبوو ، بگـــرە پـــشت گوێيـــان خـــستبوون و لـــە جيـــاتی پێـــزانين و چـــاكە دانەوە پتر بەرەو قوڵايی ئەفريقا ڕەوانەيان كردوون و بەهۆی ئاوو هەوای ناخۆش و ناهەمواری ئەم دەڤەرەوە ئەم تاقمە هەمەوەندە دەست بەسەرە لەناو چوون و فەوتان .

ئـــەم هەڵوێـــستە ناڕەوايـــەی دەوڵـــەت كـــە ئەوپـــەڕی ناحـــەق و بێـــدادیی و ناعاديلانە بووە بەرامبەر ئەو گروپەی هەمەوەند زۆر دڵگيری كردم زۆر جار بەسووربوون و پێداگرتنەوە سەرزەنشتی كاربەدەستانم كردوو بەچاومدا دانـەوە و پـێم گـووتن : ئـەم جـۆرە كـارە نـاوو ناوبانگيـان خـراپ ئـەكات و بەخراپی ناوتان ئەزڕێ . هەروەها پێم گوتن : ڕەوا ئەوەبوو ئێوە هەموو هەمەوەندەكان بێ جياوازی ببەخشن و ئەوانەش كەلە تەرابلوس دەست بەسەر بوون ئازاد بكەن و ببيان هێننەوە سەر جێ و ڕشێی خۆيان ياخود ئەوانـــەی لەشـــەڕدا گـــيراون و ئەوانـــەی بەقاچـــاخی لـــە تەرابلوســـەوە هاتوونەتەوە بێ جياوازی ڕەوانەی ئەفريقا دوور وڵات بكرێن وەك ئەوانی تر . ئەو هەوڵەی دام و ئەو كۆششەی كردم بێ سوود بوو[١٥] .\

---

[١٥] باڕۆن ئيدوارد نۆڵد (وەرگێڕانی دكتۆر حەميد عەزيز) گەشتێك بە عەرەبستان و كوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی يەكەم ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ١٤-١٥-١٦ .

## چەند بەڵگەنامەیەك دەربارەی هەمەوەند

**یەکەم بەڵگەنامە :**

ئەو هەمەوەندانە کە دوور خراونەوە بۆ ویلایەتە زانراوەکانی شاهانە ، تا ئێستا سی و دوو لە سێواس و نۆ لە قونیا کەسەرجەم چل و یەك کەسن هەڵاتوون بۆلای موسڵ و کەرکوك و شەڕیان کردووە . وەڵامی وەرگێڕاوی والییەکان دوو پارچە تەلەگرافە : ئەوانە کەماونەوە بۆئەوەی لەسایەی شاهانەدا ڕێگایان نەدرێت لاساری و ناپاکی بکەن ، ڕێو شوێنی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکان دانراوە ، ئەمجارە وەڵام لەویلایەتی موسڵ و قوماندانی کەرکوك و پارێزگای سلێمانی وەربگیرێت و هەریەك وێنەی ئەو جێگایەی کەلێی دەرچووە ، دەنێردرێت بۆ جەنابی شەهریار . ئەم هەواڵانە لە سێ بروسکەدا هەن : بەسایەی جەنابی شاهەنشاوە تا ئێستا هەشت کەس لە هەڵاتوانی هەمەوەند و چوار کەسی غەوارە کە دەبنە دوانزە کەس کەوتوونە دەست و ، بروسکە لەبارەی خراپی و ڕەفتاریانەوە بەدەست گەیشتووە ، ئەو ڕێنوێنیانەی بەندەتان دراونە هەریەکە لە عەسکەری شاهانەتان و سوارەکانی عەشایەر و ئەو مەفرەزانە کەلەمانە دروست کراون نێردراون و تاقیب کردن بەهۆی ئەمەوە بەگەرمی بەردەوامە .

سەرکەوتنی ئێمە لەهەرباریێکدا و بەسایەی جەنابی خلافەت پەنهاوە دیار دەبێ . ئەگەر کەمێك درێغی کردنیش هەبێت ، بەم نزیکانە بەتەواوی سەرکەوتن بەدەست دەهێنرێت . هیوامان بەلوتفی خوایە ئەو شتەی کەئێوە چاوەڕوانین ئاگادارین لەبارەیەوە ، ئەگەر ئەمڕۆ من عەرزیشی بکەم هەمووی فەرمان و لوتف و چاکەی حەزرەتی وەلی ئەمرە .

لە ١ ی ڕەجەبی ساڵی ٣٠٥ دا (١) مارتی ساڵی ٣٠٣ دا .

بەندەتان

ئیسماعیل محەمەد شەریف

**دووەم بەڵگەنامە :**

**وەرگێڕاوەکەی :**

**برووسکەی مەئموری ئیسلاحات ئیسماعیل حەقی بۆ سەدری ئەعزەم :**

**ڕۆژی نووسینی لە ١٤ی تەموزی ١٣٠٣ی ڕۆمی (١٨٨٦.ز) دایە و بە ژمارە ٤٧٧ ی ڕۆژی ١٥ی تەموز لە کەرکوکەوە نێردراوە ، داوای تێدا کردووە هەمەوەندەکان دوور بخرێنەوە بۆ ئەنادۆڵ ، برووسکەکە گوتوویە : هەمەوەندەکان بەڕەزامەندی سوڵتان عەبدولحەمید دوور خرانەوە بۆ موسڵ و ماردین و هەکاری ، بەڵام پاش ئەوەی کاری خراپیان لێ وەشایەوە ، کەلەوانەیە زەوت کردن و تاڵان کاری بێت ، لەوناوچانە هەڵاتن . بۆیە ئیسماعیل پێشنیاری کردووە دوور بخرێنەوە بۆ ئەنادۆڵ ، دوور خرانەوەیشیان بۆ ئەو ناوچە ناوبراوانە کەم و زۆر پێش ڕۆژی ٣ی حوزەیرانی هەمان ساڵ بووە .**

**ئەمە وەرگێڕانەکەیەتی :**

**(١٤٤ خێزانی هەمەوەندم بۆ موسڵ و ٣٣ خێزانم بۆ ماردین بە ڕەزامەندی ئیرادەی سوڵتان و ٤٦ خێزانم بۆ هەکاری دوور خستەوە وەك لە برووسکەی ٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٣٠٣ دا هاتووە . دوای ئەوەی برانە ئەم ناوچانە و مامەڵەی خراپیان لەگەڵ دانیشتوانانیاندا کردوو لەبەر ئەوەی ناگەڕێندرێنەوە بۆ ئەم ناوچانە ، تکایا بگوازرێنەوە بۆ ناوچەی دوور لە ئەنادۆڵ و ڕەزامەندی سوڵتان لەسەر ئەم کارە پێویستە .**

**لە ١٤ ی تەموزی ١٣٠٣ دا .**

**یاوەری ئەکرەم مەئموری ئیسلاحات**

**ئیسماعیل حەقی**

سێیەم بەڵگەنامە :

بەڵگەنامەیەك بە ئیمزای تاهیر موتەسەریفی سلێمانییەوە سەبارەت بە تاقیب کردنی هەمەوەندەکان لەلایەن هێزەکانی عوسمانی و شێخ موستەفای نەقیب ( نەقیبی ساداتی سلێمانی کوڕی سەید محەمەدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ ) ەوە ئەویش لە ڕۆژی ٢٩ی شوباتی ساڵی ١٣٠٣ (٢٩ ی شوباتی ساڵی ١٨٨٦.ن) دا .

هێزەکانی تاقیب کردن بریتی بوون لە ٨٠ کەس لە سادات و بەسەرکردەیی شێخ مستەفا و ٨٠ زەبتیە . ئەم بەڵگەنامەیە لە دانانەی ئەسڵیەوە ڕۆنووس کراوەو لەلایەن مەئموری ئیسلاحات موشیر ئیسماعیل حەقی پاشا کوڕی محەمەد شەریفەوە بەراورد کراوە و ئەمە وەرگێڕانەکەیەتی :

حەمەجانی حوکم درا و کە هاوکاری هەمەوەندەکانی دەکرد ، هاتەپاڵ حکومەت و هەمەوەندەکان بەهۆی سوڵتانەوە ناتوانن هێزەکانیان زیاد بکەن بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان و بەرخودانیان کەم بۆتەوە . ئەمرۆنەقیب سەید موستەفا ئەفەندی لەگەڵ ٨٠ کەسی سادات و هەمان ژمارەی زەبتیەدا چوونە دەرێ بۆ تاقیب کردن ، پشت بەخوا سەرکەوتنی تازە بەدەست دێت و ئەنجامە خۆشەکان بەم نزیکانە بەرچاو دەخرێن .

٢٩ ی شوباتی ١٣٠٣ .

موتەسەریف سلێمانی

طاهر

هاچوونی ئسڵەکەیە لە ١ ی مارتی ١٣٠٤ دا

قوولکەری (٢)

ئیسماعیل حەقی

**چوارەم بەڵگەنامە :**

ئەم بەڵگەنامەیە لە ١١ ی ١١ ی ١٩٠١ دا دەرچووە لە دائیرەی کاتبی یەکەم (باشکاتب – سرکاتب) ی سەرای یلدزی شاهانە (یلدز سەرای همایون) و بە ئیمزای (تحسین) ی باشکاتبی سوڵتانە (سوڵتان عەبدولحەمید) بە مێژووی ١٣ی شەعبانی ١٣١٩ی کۆچی ١١ ی تشرینی دووەمی ١٣١٧ ی ڕۆمە عوسمانییە و نمرەی (٥٩٤٧) .

وەرگێڕانەکەی :

لە ویلایەتی موسڵەوە هاتوون و هەمەوەندەکان داوای پەنابەری و لێبووردنیان کردووە و دەخالەتیان قەبووڵکراوە و داوایان کردووە ئەو بڕە ڕۆژانەیەیان بدرێتێ کە لە ئەدەنە کە پێیان دەدرا . وەکیلی والی موسڵ ئەمەی عەرز کردووە و داوای ڕەزامەندی گەورە جەنابی شاهانەی کردووە و لەم بارەیەوە خاوەنی فەرمانە .

لە ١٣ ی شەعبانی ساڵی ١٣١٩ی کۆچی و ١١ تشرینی دووەمی ساڵی ١٣١٧ی ڕۆمی .

سرکاتبی

حەزرەتی شەهریاری

بندە تحسین

**پێنجەم بەڵگەنامە :**

خاوەنی دەوڵەت حەزرەتی گەورەم

لەسایەی حەزرەتی پاشاوە کاروباری سوڵح و ئاشتی سەری گرت و وردەکارییەکانی لەلایەن منی کەم تواناوە عەرزی جەنابی گەورەی نەزارەت پەناه کرا کە خێڵەکانی هەمەوەند و شوان و شێخ بزێنی بڕیار لەسەر پێکهاتنیان درا و ئەو شتانە کەتاڵان کراون و لەدەستیاندایە دەبێ بیدەنەوە بەیەکتر . سەرانی خێڵەکان ڕاسپێردران دەبێ پشتیوانی ئاسایش و ئارامی و هێمی گشتی بکەن و تەواو کردنیان لەلای منە . بەپێی ئەو

ڕاسـپێری و ئاگادارییانـه کەبـەمن گەیـشتوون ، لـەلای سـلێمانی سـەرۆکی جاف خاوەن سەعادەت مەحموود و عوسمان پاشای قایم قامی گوڵعەنبەر و فەزیلـەتی مـستەفا ئەفەنـدی نـەقیبی سـلێمانی و لـەلای کـەرکوك خـاوەن فەزیلــەت حەسـەن ئەفەنـدی مـوفتی شـار و ئەحمـەد بـەگ لـە ئەنـدامانی ئەنجومـەنی بـەڕێوە بردنـی لیـوا و حەسـەن ئاغـای بینـا باشـی ، تـابووری جەندرمەی کـەرکوك و ڕوومـان کرده چەمچەماڵی ناوەندی قـەزای بازیـان و ماوەیەك لەوێ ماینەوە . ڕێ و شوێنی بنچینەیی سوڵح و پێکهاتن بەپێی ڕێنـوێن و ڕاسـپاردەکان دانـرا و ئاسایش و ئارامی نێـوان هـەردوولا بـەجێ هات و دەست پێشخەری کرا و تـا دووبـەرەکی نـەمینێ و هـیچ ڕوونـەدات . کـردەوەی حکومـەت و خزمـەتی چـاك لەگـەڵ سـەرۆکانی خێڵـەکان و پیـاو ماقوڵانــدا لــەو دەووروو بەرانــەدا بەرچــاو بــوون . نمونــەی ئەمانــە لــە دەرکـەوتنی سـۆزی ئێـوەدا دەبنـە هانـدان . هـەروەها حکومـەتیش سـوود و شتی باشی بۆ پەیدا دەبێ . ئاسایش و ئارامی ماوەیەکی درێژی لەمەو بەر بـەهۆی ئـەو ناوبراوانـەوە لـە چەمـچەماڵ پەیـدابووە . قومانـدانی مـەفرەزەی عەسکەری بناباشی حاجی ئەفەندی زەیت و خزمـەتی چاکی دابن کـردوون و ئەمە خەڵکیش پەسەندی کردووە و مەدالیای شانازیی دڵخۆشـی بـدرێتێ و لەلایەن بەرزی ئاسەفانەوە پشتیوانی بکرێت ، هەروەها مەدالیایـەکی زێـڕ ببەخـشرێت بـە ڕەمـزی ئەفەنـدی کـاتبی ویلایـەت تـا ببێتـە شـایەتی بـەرزی دادپەروەری بێ کەم وکوڕی ئەمـەیش فـەرمانی حـەزرەتی خـاوەن فەرمانـە .

لە ٢٩ی جمادی الاول ساڵی ١٣١٦ی کۆچی ، ٣ی تشرینی ٣١٤

موصل والیسی

مشیر

بندە

السید محمد عارف

**شەشەم بەڵگەنامە :**

بەڵگەنامەیەك سەبارەت هەم بەهەڵاتنی ئەو هەمەوەندانە كە دوور خرابوونەوە بۆ سیڤاس و قونیە و ، هەم بەو شەڕ و شۆڕە كە لەنێوان هەمەوەند و سوپای عوسمانیدا لە داقووق ڕویدا و ناوی كوژراوەكانیان و دەستگیركراوەكانیشیانی تێدان . مێژووی بەڵگەنامەكە ٢٨ی شوباتی ١٣٠٣ی ڕۆمی (٢٨ی شوباتی ١٨٨٦.ز) یەو ژمارەكەی (١٤٥٦) ە .

دەقێك لە پەراوێزدایە لەسەر ئەوە كەهاوجووتی دانەی ئەسڵییە و ئیسماعیل حەقی پاشای مەئموری ئیسلاحات لە ١ی مارتدا لەگەڵ ئەسڵەكەیدا بەراوردی كردووە . ئەمە نیشانەی ئەوەیە كەلەدانەی ئەسڵییەوە وەرگیراوە و لەوانەیە تێبینی یەكی خۆی پێوە كردبێت سەبارەت بە هەڵاتنی هەمەوەندەكان لە سیڤاس و قۆنیە و لەگەڵیدا بڵاو نەكراوەتەوە ، بەڵگە لەناساندنی بەڵگە نامەكەدا ئاماژە بۆ هەڵاتنیان كراوە.

وەرگێڕانەكەی :

ئەحمەد ئاغا و مەحموود چینە لەڕێگرانی هەمەوەند پێشەكی كوژران و پێنج كەس دەستگیر كران و ئەوانیش بریتین لە میرزا لای لە پیاوەكانی حەسەن بەگی جاف ئەوی تر كاكەوەیس و حامید ڕەشید عبدولڕەحمانی بازیانی و هەروەها ئەبو سەباحلی محەمەد و ئەوی دیكە هاوڕێی ساڵح و ئەمرۆتەسلیمی بەندیخانەی كەركوك كران و ئەوی تر كەریم قادرە كە لەشەڕەكەی دوو ڕۆژ لەمەو بەردا بەبریندارى كەوتە دەست مەفرەزەی (علی حیزار) ی قایم قام و تەسلیمی دەسەڵات دارانی حكومەت كران لە چەمچەماڵ .

ئەو شەڕە كە لەنزیكی داقووق ڕویدا ، عەلی عەبدولرەزاق لە تیرەی ڕەشەوەند و عەلی كوری قادر ئەحمەد قەبانی لە تیرەی ڕەمەوەندتێدا كوژرا و ئەحمەد بازەی تێدا گیرا و سێ تەرمی هەمەوەند دۆزرانەوە و نەزانرا ناویان چییە و بریندارەكانیان نەكەوتنە دەست و ناویان نەزانراوە و

سەروبەندی شەڕێکی دیکەش یەکێك لە ڕووباری کۆپری خنکاو هەرچی زیان و برینداره‌کانی تریشه ناویان للایەن ئیستیخباراتەوە نەزانراوە و جەنەڕاڵی سەرکردایەتی ئەمەی بەرچاو خستووە .
لە ٢٨ی شوباتی ساڵی ٣٠٣ دا .

فەریق عەلی
هووجوتی ئەسڵەکەیە لە ١ ی مارتی ساڵی ٣١٤ دا
بەندە ئیسماعیل حەقی[١٦]

## چەند چیرۆکێك دەربارەی هەمەوەند

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەگەشتی ملەی تاسلوجەدا دەڵێ : ئەو چیرۆکانەی لەبارەی ئازایەتی و پاڵەوانێتی جەربەزەیی خێڵی هەمەوەندەوە دەگێڕێتەوە ، لەگەڵ باس کردنی هێرشی کتوپڕییەکانیان و تاڵان و بڕۆ و کوشتارەکانیان ، کەپیشەی ڕۆژانەیان بووە و بێ ماندوو بوون و ناڕەزایی دەربڕین کردویانە ، زیاتر لەئەفسانە دەچێت . لەڕەوشتە جوانەکانیشیان ئەوە بووە کەبەهیچ جۆرێك توخنی ئافرەت نەکەوتوون . تەنانەت ئەگەر زێڕ و گەوهەریشیان پێ بوبێ ، هەروەها ڕۆڵەکانی ئەم خێڵە بەخاوێنی جل و بەرگەکانیان ناوبانگیان دەرکردبوو . دەست وەشاندنە ترسناك و کارامەییەکانی هەمەوەند تائێستاش وەکو پەند لەشارە عەرەبییەکانی وەك بەغدا و موسڵ و تەنانەت (بەسرە)ش دەماو دەم دەگێڕنەوە . چونکە سنوری هێرش و هەڵمەت بردنەکانیان دەشتەکانی بەغدا و خانەقین و ناوچەکانی دەورو بەری زەهاو و کرماشان و هەمەدانیشی گرتبووەوە . دایکان بەناو هێنانی هەمەوەند منداڵەکانیان دەترساند ، گەرچی منیش

---

[١٦] عەبدولرەقیب یوسف ، گۆڤاری هەزار مێرد ، سلێمانی ، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩.ز ، ژمارە ١٠ .

منداڵ نەبووم  بەڵام ئەوترسەم بەرکەوت[١٧] . نالەپێ پان[١٨]چەتەیەکی ئازا و بـەهێز و زەبـر بـوو لەسـەرەتای سـەدەی نـۆزدەدا ناوچـەی سـلێمانی و هەمەوەنـدی خـستبووە لـەرزەوە ، گەورەزەنـەقی لێ دەچـوو، منـداڵ بـەناو هێنانی لەبێشکەدا ژێر دەبووەوە، گەلێك کاروانی ڕووت دەکردەوە، دەیـەها جەندرمە و سەربازی کوشت ، بگرە زیاترلە دەساڵ بڕ و بکوژ خۆی بوو . کاتێك نالەپێ پان بەساڵاچوو فرسەتیان  لێ هێناو گرتیـان . گرتنـی نالـەپێ پان هـەرای نایـەوە خـەڵکی بەپـەرۆش بوون بەزیندویی لەنزیکـەوە سـەیری بکـەن . مـیری جاڕیـدا کەلـە فڵانـە ڕۆژدا نالـەپێ پـان لەسـێدارە دەدرێـت . منداڵ و گەورە ڕژانە سەر جادەو شـەقام و سـەربانەکان. دە پـانزە جەندرمـە نالـەیان لـەژووری حـەپس خانـە دەست بەکەلەپـچە و پـێ لەتەوقـدا هێنایـە دەرەوە نالـە وتـی : ئەگـەر لـەو بڕوایـەدان بەکوشـتنی مـن تـۆوی خراپـە لـەم جیهانـەدا نـامینێ ، ئـەوە سـەهون ، زۆربەئازایانـە خـۆی چـووەتە  بـەردەمی پەتی سێدارەکە و سەرکورسییەکە کەوت پـێش ئـەوەی کورسـییەکە لەلایـەن جەندرمەکانەوە لابرێت ، نالەپێ پان خـۆی شـەق لەکورسـییەکەی ژێـر پێـی هەڵئــەداو ئــەخنکێت . ئــەم ڕوداوەش لەســاڵی ١٩١٠.ز دا بــوو ، ئەوکاتــە ئەمین فەیزی بەگ قوماندانی (کۆڵۆنێل) سلێمانی بوو .

کاکە ڕەشید شەوقی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵـێ: لـەو دەمـەدا حکومـەت ئەمری دا بەباوکم کە بچێت بۆ ناو هەمەوەند بـۆ پـارەی میری سـەندن . ئـەو وەختە فەوجە عەسکەر نەی ئەتوانی بە (دەربەندی بازیـان) تێپـەڕبێت لەبـەر چـەتەیەتی هەمەوەنـد . کەچـی بـاوکم قـەبوڵی کـرد و چـوو ، منیـشی لەتـەك خۆیا برد . ئەو دەمە گەورەی هەمەوەند ناوی ((محمود ئاغا)) بوو لە خێڵـی ڕەشـەوەند ، یەکسـەر چـووین بـۆ لای ئـەو . ئـەو وەختـە بـەهار بـوو ، لـەناو چـادر و ڕەشماڵـدا بـوون ، لـە پـاڵ شـاخی دەربەنـدی بازیـان بـە ڕوکـاری

---

[١٧] تۆفیق وەهبی ، (وەرگێڕانی ئەحمەد ڕێبوار) گەشتی بازیان تاملەی تاسلوجە ، گۆڤاری ڕامان ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠١.ز ، ژمارە ٥٥

[١٨] دکتۆر احسان فواد ، گۆڤاری ڕەنگین ، بەغدا، ساڵی ١٩٨٨.ز ، ژمارە ٣ .

ڕۆژئاوادا و بەرامبەر دێی تەکێ ، چووینە ڕەشماڵی دیوەخان زۆر گەورە بوو ، لە بەردەمیشیا زۆر ئەسپ بەسترابووەوە و زۆری بە زینەوە بوو وە توورەکەیان بەسەرەوە بوو . پیاو و کوڕی هەمەوەند هەمووی چەکدار بوون . ئیتر زۆر ڕێزیان گرتین . وە بۆ ئێوارێ هەموو لە دیوەخان کۆبوونەوە و مەلا سەرچەرمگێك هات بانگی داو نوێژیان لە پشتیەوە کرد . لە پاشان بە ئاو بەر بانگیان شکاند و ، بە چاوە یەکی نان ساجییەکیان خوارد و ، لە پاشان لەماڵی ((فەتاح بارام)) ی هەمەوەند سینییەکی پڕ کاکڵە گوێز و باسوق و خورما و مێوژ و ، لە پاشان پرتەقاڵ و لیمۆ هات . ئینجا مەحموود ئاغای رەئیس کە پێیان دەگووت (مەخۆل) هەمەوەند ، ڕوویکردە باوکم ، وتی : سەعید ئەفەندی وامەزانە (فەتاح) ئەمە هی خۆیەتی . ئەمە بەرامبەر بەخوێنی خۆیی و کوڕەکانی هینی تاڵانییە ! گوێز و مێوژ و باسوقەکە هی کاروانی هەورامی و سنەییە ، خورما و پرتەقاڵ و لیمۆکەش هی کاروانی نێوان خانەقین و بەغدایە . فەتاح لە پێش ڕەمەزان کەدابێ ، بۆ خواردەمەنی شەوی ڕەمەزان و بۆ بەربانگ و ، بە کوڕەکانی و پانزە سوارەوە ناردمان بۆ ئەو ناوە . ئەمانەیان لە کاروان سەنگەو ، لەم تاڵانییەدا هەر زەلامێکمان بریندار بووگەو وڵاغێکمان کوژرا گە . بەڵام جێی وڵاغەکەمان پڕ کردۆتەوە و ، زەلامەکە هێشتا زەریف خاس نەبۆتەوە . جا باوکم وتی : خۆ ئەمانە هەمووی حەرامە کەبەم ڕەمەزانە پیرۆزە ئەیخۆین . فەتاح بارام هەڵیدایە وتی : سەعییەفەنی بۆ ئێمە زۆر حەڵاڵە و لە مەعاشەکەی ئێوە حەڵاڵ ترە ، وە سەرە چەرمەگەکەی مەلا و ((گون ڕەش و گون سوور)) ی کوڕانم ! ئەم فەتاح بارامە دوو کوڕی هەبوو ، بەڕەنگی گونیانەوە ناوی نابوون ، کە خۆیی و هەردوو لاوەکەی لە ئازایی و ڕەشیدی ناویان دەرکردبوو ، لە چەتەیەتیشدا یەکەم بوون و باوك و کوڕەنوێژ کەر و ڕۆژوو گریش بوون ! جا باوکم وتی : کاکە فەتاح بۆچی حەڵاڵ ترە لە موچەکەی

ئێمه ؟ فەتاح وتی : پێت بێژم ئێوه مانان بووگن وەپیاوی ڕۆمی (تورك) .
هەتا بابان  بوو ، ڕاست بوو خۆمان بوو ، ماڵ و خێزانی خۆمان بوو وه
زمانمان یەك بوو برا بووین جا ماڵمان ، پارەمان بۆیەك حەڵاڵ بوو . ئێستا
ڕۆمی (تورك) ی زەمانی پێشوو هاتوونەتەوه سەرمان ، هەرچییەکمان پیٚ
شك بەرن ، ئەیانەویٚ لیٚمان بسێنن و ، هەرچییەکمان لیٚ بکەن نابێت دەنگ
بکەین ، چونکه ئێژن ( قاونوون ) ئی خەلیفه وا ئەفەرمویٚ چی بکەن نقه
نەکەی ! سەرانەی خۆمان و ماڵاتمان و پارە بقەبلێنین و بیدەین
پێیان و ، ئەگەر پارە نەوو ئەبیٚ ماڵ بدەیی و ، ئەگەر هاتی و بەڕەنجی
شان زەراعەت و فەلاحەتت کرد، جا ئەو وەختەش ((خەفیه فەندی)) دێت
وەك ئیزرائیل بۆ سەرت . ئەبێت یا مەڕی بۆ سەربڕی و ، یا مریشك
دەرخواردی بدەیی و ، هەروەکو خزمەتکار دەستەو نەزەری ڕاوەستی .
وه لەسەر ئەوەشا ئەگەر پێی شك بردی ، چەند پارەت لیٚ وەربگریٚ ! ئەگینا
بەخەفی ماڵت وێران دەکات و ئەگەر خوا نەکردە کارێکت کەوتە لای
حکومەت ، ئەبیٚ بکەویته سواڵ . ئینجا کارەکەشت هەر له جێی خۆیەتی .
جا ئێمەیش هەمەوەند ، وەك عەشرەتی تر وەك شاری ، سەرمان بۆ ئەم
حکومەتە چونکه شۆڕ نەکردووه و ئەمانەیان لیٚ قبوڵ ناکەین. لەخۆمان
زیاتر خزمەتکاری بێگانە ناکەین و نەمان کردووه ، لەبەر ئەمە حکومەت
لەشکر دێنێتەسەرمان ، ئەمان کوژێت و تاڵانمان دەکات . وەئەمانەش کە
ئەکات ، ناش زانین بەرامبەر بەچی چاکەیەکێتی ، هەر ئەوەندە بەناو
خەلیفەیە ! جا ئێمەش هەمەوەند لەبەر ئەمانە وازمان له کاسبی و فەلاحەت
هێناوه و ، هەروەك و موهاجیر خۆمان سوك بار کردووه و لەخۆمان
بووردووین. وه لەزەمانی شەریف هەمەوەند خەبەر نێررا بۆ عەشرەتەکان و
بۆ شار کەبێن بە یەك و ڕۆمی لە وڵات دەرکەن و هەروەکو جاران ببەنەوە
بەحکومەت ، هەروەکو بەقسەیان نەکرد ، لەتەك ڕۆمی چوون بە گژیانا و

شەریفیان کوشت ! وە کوێخا نەرگس[19] ناو کە ژن بوو ، ئەویش هەڵسا بەرامبەر بە ڕۆمی و ، ئەویشیان هەر کوشت . وەچەند جار پاك لە پاك هەمەوەند تاڵان کراوە و ، لێی کوژراوە و گیراوە و نەفی کراوە . جا لەبەر ئەمانە دەستمان کردووە بە چەتەێتی بەرامبەر بە حکومەت و خزمەتکاریان و ماڵیشیان و ، کوشتنیشیان لەلامان بووە بەحەڵاڵ وەکو شیری دایکی گون ڕەش و گون سوور . ئیتر وا دووروو درێژ تێم گەیانی ئەفەنی . ئەمە هەمووی قسەی ئەو فەتاح بارامە نەخوێندەوارە هەمەوەندە بوو کە بۆ باوکمی ئەگێڕایەوە[20] .

## شەڕی نێوان هەمەوەند و شێخ مەحموود

بەڵگەنامە : لەبارەی دەنگوباسی ناو شاری سلێمانی .

لەساڵی ١٩٠٥.ز .

لەمێژە ناکۆکی کەوتۆتە نێوان شێخان و هەمەوەندەکانەوە . لەنێوان (١٠) ی مایس – ەوە تا (٢٣) ی مایس ، ئەم دەنگوباسە لەناو شاردا دەبیسترێن . هەمەوەندەکان لەم ڕۆژانە شێخ نەجمەدین سەید نوری زادەیان شەهید کرد . بۆ تۆڵە سەندنەوە شێخ مەحموودی شێخ سەعید و شێخ سەعیدی گۆپتەپە و چەند ساداتێکی تر ، لەگەڵ دوو هۆزی (تەرخانی و رۆغزایی) کۆبوونەوەیەکی گەورەیان کردووە ، تاوەکو بدەنە سەر هەمەوەندەکان وتۆڵەیان لێ بسێننەوە . ئەم جۆرە شەڕ و شۆڕانە جار جار بەشێوەیەکی دڕندانە گڕدەستێنێ شتی وا بەیەك دەکەن مەگەر دێوو درنج بەیەکیان کردبێت . ئەم لەشکرە تۆڵە سێنە لە ئاوایی داریکەلی (٧٠٠–٨٠٠) سوارە و پیادەیان ئامادە کرد ، وەك زانراوە کە پێشڕەوی

---

[19] کوێخا نەرگس : یەکێك بووە لە ئافرەتە ناودارەکانی خێڵی شوان .

[20] سدیق ساڵەح ، بەسەر هاتووی کاکە ڕەشید شەوقی ، بنکەی ژین ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٣.ز ، لاپەڕە ٨٢–٨٣–٨٤–٨٥ .

ئەم لەشكرە گەورەیە هێرشی كرە سەر هەمەوەندەكان . نزیكەی بیست یان سی سوارەی  هەمەوەندیان لێ دەر پەڕیوەو تار وماریان كردن و دە پانزە كەسیشیان لێ بەدیل گرتن . دیلەكانیان چەك كردن و ئەسپەكانیان لێ وەرگرتن ، ئینجا بەڕەڵایان كردن ، ئەم ڕەوشتەی هەمەوەند مایەی سەرسوڕمانە و شیاوی نووسینە . ژمارەی كوژراو و بریندارى هەمەوەندەكان نەزانراوە ، بەڵام لە چاو هێرش بەراندا زۆر كەم بووە ، ئەم تێكشكانە خوێنی شێخانی هێنایەوە جۆش ، ئەم جارە لەشكرێكی زۆر گەورەتریان لە هۆزەكانی جاف ، پشدەر ، باجەڵان ، شوان ، جەباری ، بە (١٥٠٠–٢٠٠٠) چەكدارەوە ئامادەكرد ، هەمەوەندەكان كەئەم دەنگوباسەیان پێ گەیشت لەترساندا ئاواییەكانی ناوچەی (بازیان) یان چۆڵ كرد و بەرەو نزیك شاری كەركوك ڕەویان كرد .

هێرش بەران كەهاتنە سەر ئاواییەكانی هەمەوەندەكان هەرچی تیابوو تاڵانیان كردوو دەغڵ و دانیان سووتاند .

ئەم سكاڵا نامەیەی كەلە (٢٠ نیسانی ١٣٢٥.ز ) درایە نووسینگەی ویلایەتی موسڵ پاش ئەوەی كەوالی نوێ گەیشتە ئەم شارە ، شەو تەقە ئارامی لەخەڵك هەڵگرت ، هەمەوەندەكانیش لە دەووروو پشتی شار خەریكی چەتەگەری بوون ، هەنێ لە فەرمانبەرە توونە ڕەوەكان دروستی كارەكەیان ئاوەژۆ پێكرد و ئوباڵیان خستە سەر بەرەی شێخان ، من كە ئەمە پێنج ساڵە لە سلێمانی فەرمانبەرم ، دەڵێم چەند كەسێك نەبێت دانیشتوانی شار هیچ گوناهێكیان نیە ، ئەم چەند كەسانە ئەو دوو بەرەكیانەیان ناوەتەوە و درۆ و دەلەسە بڵاو  دەكەنەوە ، ئەم سكاڵا نامەیە بۆ (كەوثە ر ئەفەندی) بەڕێوبەری ئەوراقی ویلایەتی موسڵ ، لەساڵی ١٩٠٥.ز [٢١] .

---

[٢١] مستەفا نەریمان ، ئامادەكردنی هیدایەت دەلۆ ، گۆڤاری ڕامان ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٢.ز ، ژمارە ٦٧ .

لەساڵی ١٩٠٨.ز لە موسڵ لە پیلانێکدا شێخ سەعید و ئەحمەدی کوڕی چەند پیاوێکی کوژران . بەڵام شێخ مەحموود خۆی لە ماڵی مەحموود خدر هەمەوەند شاردۆتەوە[٢٢] (مەحموود خدر هەمەوەند ئەوکاتە لەموسڵ پلەی طابور غاسی) بووە .

کوژرانی باوکی شێخ مەحموود لە کوردستانداو بەتایبتی لە هەردوو شاری سلێمانی و کەرکوکدا زۆر دەنگی دایەوەو لەو سەرو بەندەداو خێڵی هەمەوەند ئۆقرەیان لێ هەڵگیراو پیاو ماقوڵانی کەرکوکیش داوایان کرد شێخ مەحموود دەست بەجێ ئازاد بکرێ . پاش ئازاد کردنی شێخمەحموود لە موسڵ و گەیشتنەوەی بۆ کەرکوك . خێڵی هەمەوەند ئاژاوەیەکی زۆری لەناو شاری سلێمانیدا نایەوە و والی موسڵ داوای لە تۆفیق پاشای موتەسەریفی سلێمانی کرد کە شارەکە بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ بەغدا.

خێڵی هەمەوەند لە وەڵامی کوژرانی شێخ سەعیدی زاوای ، کەوتە ئەنجامدانی زۆر کردەوە وەك برینی ڕێی گشتی سلێمانی و کەرکوك و هێرش کردنە سەر بارەگای پۆلیسی قەرەداغ[٢٣]

ڕاپەرینی هەمەوەندەکان دوو ساڵ درێژەی کێشا ، لە پایزی هەمان ساڵداو هاوینی ساڵی ١٩٠٩.ز دا دایان بەسەر ماڵی داد پرسی سلێمانیداو هەرچییەکیان هەبوو تاڵانیان کرد . ڕێگای هاتووچۆیان بڕی ، هێرشیان کردە سەر بەتالیۆنێکی تورك و دوانزە کەسیان لێ کوشتن کە یەکێکیان سەر لەشکر بوو لەگەڵ چەند ئەفسرێکیش ، چل و پێنج کەسیان لێ بەدیل گرتن و هەموو چەکەکانیشیان لێ داماڵین و وڵاغەکانیشیان لێ سەندن . ئەوەش کە بە زیندویی مایەوە ماوەی سی و شەش میل ڕەتاندیانەن و زۆریان لێکردن کەدەبێت بە پێ ڕێگای گەڕانەوە بگرن . لەو ڕۆژەداهەمەوەند بووە

---

[٢٢] دکتۆر عەبدوڵا عەلیاوەیی ، کوردستان لەسەردەمی عوسمانیدا ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ٢٣٢ .

[٢٣] هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە ٢٣٣ .

خـــاوەنی تفــەنگی مـــاوزەری خــۆیی و گـــەورەترین هەڕەشـــەش بـــوو بــۆ سلێمانی ، کە چەند جاریٚ تریش بەر پەلاماریان کەوت . لەهاوینی ساڵی ١٩٠٩.ز دا لــە شــکری عوسمــانی لــە چەمــچەماڵدا خــەریك بـــوو خــۆی کۆدەکردەوە ، بەڵام هێشتا سەر لەشکرەکەیان نە گەیشتبۆ جیٚ ، ئەمەیان بەهەل زانی سەرچاوەی ئاویان لیٚ بڕی ، خێوەتی پاسەوانەکانیان ڕفاندو بەبیٚ خشپە کشانە دواوە . دوای ئەمە دادپرسی سلێمانی و کەرکوکیش گەیشتنە چەمچەماڵ بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کێشەیە تا دادگا دابمەزرێنن بۆ سزادانی هەمەوەندەکان . بەڵام شێخانی سلێمانی کەوتنە بەرتیل دانی هــەردوو داد پرســەکە و چــەند ئەفـسەرێکی ناوچــەکەش ، کەبــەدەم ئــەم کێشەیەوە نەچن و ئامادەی دادگا نەبن . ئەمانیش بیٚ وڵاغی و ناڕەحەتی ڕێیــان کــرد بــە بیــانوی نەچــوون ، کێــشەکە دێــزە بــە دەرخۆنــە کــراو هەمەوەندەکانیش لە سزا ڕزگاریان بوو . لەسەر چەتەیی خۆیان هەر سور بوون ، ڕێیان لە کاروان و ڕێبوار دەبڕییەوە ، ستونی تەلەفون و کارەبایان دەشکاند و دەسووتاند . لەهیچ کاتێکدا داد پرسی سلێمانی نەیتوانیوە لە ژێر چاودێری ٣٠٠ سوار کەمتر بگاتە چەمچەماڵ . ئەویش سوار چاکی کەڵـەمێرد ، کەگـەلیٚ جار تـووش هەمەوەنـد دەبـوون و کوژراویـان لیٚ بـەجیٚ دەمـا ، ســەرتاپای هێــزی هەمەوەنــد بریتــی بــوو لــە ٢٥٠ ســوارو ، هێــزی بەرگرییان دژ بەسوپای عوسمانی لە ٣٠ کەس تیٚ نەدەپەڕی بەو هێزە کەمیشەوە شۆڕشەکەیان بەجۆرێك تەشەنەی کردبوو ، هێزەکەیان بەش کردبــوو بــە پــەل پــەلی بــچووك و بــەجاریٚ ژینیــان بەخــەڵکی تــاڵ کــرد بوو، بەتایبەتی بازرگانی بەغدا و موسڵ ، کەشاڵاویان برد بۆمیری بۆ بەرپاکردنی ئاسایشی هاتووچۆ .

دەووڵەت فەرمانی دا بەسەر لەشکری گشتی بەغدا کەخۆی دەبیٚ بچێت بۆ تەمیٚ کردنی هەمەوەندەکان . هەواڵ گەیشتە لای هەمەوەندەکان ، خێرا گاڵیان پێچایەوە و بەکەناری سیروانەوە لە ژێر داڵدەی تیرەی (شەرەف

بەیانییەکان) بۆ سنورەکانی ئێران کۆچیان کرد . کاتێك سەرلەشکری بەغدا گەیشتە چەمچەماڵ و هیچ کەسێکیان تێدا بەدی نەکرد ، فەرمانێکی زۆر توند و تیژی بەرامبەر بەهەمەوەندەکان دەرکرد ، تەنانەت نیازیشی وابوو هێرش بکاتە سەر ئێرانیش ئەگەر داڵدەی منداڵێکی هەمەوەند بدا . لەشکری تورك بەناوچەکانی هەمەوەنددا تێپەڕی و ، بەڵام هیچ هەمەوەندێکیان بەدی نەکرد ، لەپووش و پەڵاش بترازێ ، کەلەگەڵ هەندێ خان و بەرەشدا گڕیان لەگشتی بەرداو هەموو ئەو ناوچەیەی پێ ڕەش داگیرسا . لەشکری تورك دوو مانگ لەناوچەی هەمەوەنددا ئۆردووگایان هەڵدا بۆ دڵنیا بوون لەنەمانیان . هەرچەندە چەند کوردێکی لانەوازی بێدەرەتانیان گرت ، بەناوی هەمەوەندەوە ، بەڵام هیچیان لێ هەڵنەکراندن ، دوای شەش مانگ هێرشێکی تریان بردە سەریان بەڵام وەکو ئەوانی تر بێ ئەنجام بوو . ناچار هێزەکەیان بەرەو دوا کشایەوە[٢٤] .

## ڕۆیشتنی هەمەوەندەکان بۆ جوانڕۆ

هەمەوەندەکان حکومەتی تورکیان تەنگەتاو کردبوو ، حکومەتی تورك لەپاش کودەتای سلانیك و مەشروطیە ت دووساڵ خەریکی تەکبیر بوون بۆ تەربێتی هەمەوەند . لە ژێر قوماندەیی مظهر بەگی میر ئاڵا و هەموو خێڵەکانی لیوای کەرکوك و لەشکری جاف بەرەو چەمچەماڵ هاتن . هەمەوەندەکان بەرەو جوانڕۆ بۆلای مستەفا خان چوون ئەویش بەگەورە و سەرۆکەکانی هەمەوەندی گووت : ئەگەر ئێوە ببنە لایەن گری من ، ئەوا منیش پەنا و ئیدارەتان دەدەم . لەهەمان کاتدا عەلی ئەکبەر خان کوڕی شێر خان کوڕی ئەسەد خانی حاکمی سەنجاوی لە گەڵ سەردار داود خانی کەلهوڕ کەوتە شەڕ ، عەلی ئەکبەر خان هاواری بۆ مستەفا خان هێنا مستەفا

---

[٢٤] عەلی سەیدۆ گەورانی ، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە تالیب بەرزنجی ، لەعەممانەوە بۆ ئامێدی گەشتێك بە کوردستانی باشوردا ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٠.ز ، لاپەڕە ٥١-٥٢-٥٣ .

خـانيش پـەناى دا . داود خـان بەهــەموو ســوارەى كـەلهوڕ و هەمەوەنـدى بەهتۆييــەوە داواى لــەوالى كوردســتان كـرد كـە يارمــەتى بـدات ، والــيش لەشـكرێكى بـۆ ئـەنێرێ . كاتێـك عـەلى ئەكبـەر خـان ئـەم هەشـت نـۆ هـەزار سـوارە دەبينـێ كـەدێن بـۆ سـەرى ، هـەواڵ بـە مسـتەفا خـان دەدات . لـە بـێ بــەختى مــستەفا خــان هەمەوەنــدەكان بــە چــوار تــاقم بــۆ دەووروو بــەرى سلێمانى و چەمچەماڵ ڕۆيشتبوون ، تەنها نزيكەى سەد سوارێكيان لـەلاى مستەفا خان مابوونەوە . مستەفا خان خۆيى و هەمەوەند و نزيكـەى هـەزار سوارێك دەبات بۆ يارمەتى عەلى ئەكبـەر خـان . لـەكاتى بـەرەنگار بوونـەوەدا لەشـكرى داود خـان دەشـكێنن ، مـستەفا خـان لـەكاتى شـەڕدا لەسـەر مـاين دەكـەوێ و ملـى دەشـكێ . ڕەحـيم كـاك ئـەوڵاى عـەزيز خاڵـەى هەمەوەنـد و زۆراب وانەك لەهەمەوەندەكان دەكوژرێن ، كە دوو پيـاوى زۆر ئـازا و گـەورە بوون لەناو هەمەوەندا[٢٥] . ئەم شەڕە لە ساڵى ١٩٠٩.ز – ١٢٨٨ ى هـەتاوى – ١٣٢٧ ى كۆچى لە ١٦ ى ئابان ، ٢٤ ى شەوال ڕويداوە .

لەســەردەمى حـوكمڕانى مـستەفا خـانى[*] يەكەمـدا لــە جـوانڕۆ ، سـەدان خێزانى هەمەوەند لە چەمچەماڵەوە پـەنايان بۆ مستەفا خـان برد ، ئـەويش پێشوازييەكى گەرمى لێ كردن . دەوڵەتى عوسمانى داواى لە ئێران كـرد كـە پەناى ئەو هەمەوەندانە نـەدات .حكومـەتى ناوەنـدى ئێـرانيش دەكاتـە سـەر مستەفا خان ، كە هەمەوەندەكان نەگرێتـە خـۆيى و لـە خـاكى ئێـران دەريـان بكات . مستەفا خان لـە وەڵامـدا دەڵـێ : ئەمانـە ئێـرانين و بۆ شـوێنى بـاو و باپيرانيان هاتوون ، ميوانى ئـەم ميللەتـەن ، ئەگـەر حكومـەتى ئێـران ئەمانـە پـەنا نـەدات ، ئـەوا مـن نـاهێڵم مێـژووى وڵاتەكـەم لەكـەدار بـێ ، ڕوودانـى هــەموو كارەســاتێك لــە ئەسـتۆى خـۆم دەگـرم و لــە ژێـر سـايەى پەرچـەمى ئێرانــدا پــەنايان دەدەم . ئـــەم ئازايەتييـــەى مـــستەفا خـــان لـــە لايـــەن

---

[٢٥] كەريم بەگى جاف ، تەئريخى جاف ، بەغدا ، ساڵى١٩٩٥.ز ، لاپەڕە ١٤٥-١٤٦ .

[*] مستەفا خان كوڕى حەبيب الله خانى كوڕى محەمەد بەگ كوڕى يوسف ئاغا كوڕى قوباد بەگى جافى جوانڕۆيە .

کاربەدەستانی دەوڵەتەوە پەسەندکرا و لەقەبی ( مسعود السلطنه ) یان پێ بەخشی[٢٦] .

عەلی ئەکبەر خان سنجابی (سردار مقتدر) لەساڵی ١٩١٨.ز -١٣٣٦ی مانگی ، کاتێك ئینگلیزەکان توانییان بەسەر خێڵی سەنجابیدا سەر بکەون و تەفروتونایان بکەن ، عەلی ئەکبەر خان خۆیی و براکەی سالار ظفر و برازاکەی سلێمان خان (سالار مقتدر) نزیکەی ١٥٠ سواری سنجابی بەرەو کوردستانی عوسمانی هاتن . لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە ، کاتێك گەیشتینە سلێمانی مانەوەی ئێمە دوانزە ڕۆژ بوو ، لە دەیەم ڕۆژدا بۆ جاری دووەم سەردانی موتەسەریف سلێمانیم کرد .

لەدیداری یەکەمدا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە موتەسەریف نایەوێت وەك بەرپرسێکی ڕەسمی قسەی لەگەڵ بکەم ، هەروەها لای کەس ئەم دیدارەش ئاشکرا نەکەم .

عاشوربەگ فەرماندەی هێزی کەرکوك تەلەگرافی بۆ قوماندانی ناوەندی کردبوو ، هەروەها دەستوری دابوو کە ئێمە بۆلای کەرکوك ڕەوانە بکەن . دووسەدوو پەنجا لیری مەجیدییان پێ بەخشین ، هەروەها ئالیك دووڕۆژ بۆ وڵاغەکان . ئەو شەوەی کەبڕیار بوو سبەی بڕۆین ، چەند نەفەرێك لە سوارەکان کەلەگەڵ ئێمە بوون فیراریان کرد . سلێمان کە نۆکەری من بوو تفەنگەکەی تەسلیم کرد و بە پیادە بەرەو ئێران گەڕایەوە .

ڕێگای ڕۆشتنمان بۆلای کەرکوك دەبوو بەناو خێڵی هەمەوەندا تێپەڕین . ئەم خێڵە کاتێك کە ئێمە پاسەوانی سنوری قەسری شیرین بووین ، ئەمانە بەزۆری پەلاماری سنوری ئێرانیان دەدا . لەشەڕی نێوان ئێمە و ئەواندا چەند کەسێکی ناوداری هەمەوەند کوژرا . بەتایبەتی لە دوو ڕووبەڕوو بوونەوە کەلە زەمانی اقبال الدوله و عەلاء الدوله ڕویاندا . حەوت نەفەر لە

---

[٢٦] محەمەد عەلی سوڵتانی ، ٢/١ ایلات و طوایف کرماشاهان ، تاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز ، لاپەڕە ١٨١ – ١٨٢ .

سەرکردەکانی هەمەوەند کوژرا . لەبەر ئەوەی ڕێگاکە تەنگ بوو هەردەبوایە بەناوچەی هەمەوەنددا تێپەڕین ، بەباشم زانی وەکو داب و دەستوری خێڵەکی هەر وەکو میوان بچمەماڵیان . ئەوەشم دەزانی لەلایەن موتەسەریف و فەرماندەی هێزی کەرکوك ، فەرمان دەرچووە بۆ ئێشك گرەکانی ڕێگاو بان بۆ پاراستنی ئێمە . هەر ئەو شەوە ئێمەش بەڕێ کەوتین و بۆ بەیانی خۆر کەوتن لە سنوری بازیان و چەمچەماڵ لەماڵی کەریم بەگ فەتاح بەگ نزیك بووینەوە ، کەلەڕاستیدا وەك سەرۆکی هەموو هەمەوەند حیسابی بۆ دەکرا. بەدەر کەوتنی سوارەکانی ئێمە ، کەریم بەگ لەگەڵ چەند چەکدارێك بەپەلە خۆیان گەیاندە پشت ماڵەکەیان و سەنگەریان گرت ، هەروەها ژن و منداڵەکانی لە ماڵ دوور خستنەوە . منیش کەئەمەم بینی زانیم ئەمە لەترسی ئێمە نیە ، بەڵکو لەڕق و دوژمنایەتی تورکە ، سوارێکم بەتاو نارد کە ئێمە بەکەریم بەگ بناسێت ، خۆشم بەرەو جۆگایەکی ئاو ڕۆیشتم و دەست و دەم و چاوم شووشت ، پێکەنینم بەحاڵی خۆم دەهات ، ئەوەم دە گووت : ئایا لەدونیادا خێڵێك هەیە کە دوژمنی ئێمە نەبێت !

سوارەکەی ئێمە گەیشتەلای کەریم بەگ ، ئەویش بەخێرایی هاتە خوارەوە و ژن و منداڵەکانیشی هێنایەوە . کەریم بەگ خۆی هاتە پێشەوە و زۆر بە میهرەبانی ئێمەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان . پاش بەخێر هاتنمان و گووتی : وای بەباش دەزانم کە بۆ کەرکوك نەچن ، چونکە عوسمانییەکان هەرکاتێك ئیشیان بەیەکێك بوو دۆستایەتی نیشان دەدەن ، ئەگەر ئیشیان نەما ئەوا فەرامۆشی دەکەن . باوەڕ بکە کە هیچ خێر و چاکەیەك لەوان نابینی .

منیش قسەکانی کەریم بەگم بەهەند وەرگرت ، بەڵام گووتم : ناچارم هەردەبێ بچم . کەریم بەگ شەوو ڕۆژێك پارێزگاری لێمان کرد . شەوی دواتر بەرەوە چەمچەماڵ ڕۆیشتین ، پێش نیوەڕۆ گەیشتینەجێ . حەمە ئەمین ئاغا کوڕی فەقێ قادر قایم قامی چەمچەماڵ هاتە پێشوازیمان و

ئێمەی بردە قشڵەکە ، کە شوێنێکی پاك و خاوێنی ئەفسەرەکان بوو . نیوەڕۆ نانی بۆمان هێنا و ئێوارەش بۆ شێوان دەعوەتی کردین بۆ ماڵ خۆیان . پاش نان خواردن بۆ شوێنی حەوانەوەی خۆمان گەڕایینەوە . مەحموود ئاغای هەمەوەند کەناسراوە بە مەحموود خدر کە پلەی تابوور غاسی هەبوو هاتە دیدارمان . بێ ئەوەی خۆی یان یەکێك لەکەسەکانی هەمەوەند مەیلیان بەلای ئینگلیزدا هەبێت ، بەناوی خێڵەوە ئامۆژگاری کردین کەدەوڵەتی عوسمانی جێی متمانە نییە ، چونکە ئێمە باشیان دەناسین . دڵنیابە چاکەی تۆ بەخراپە وەڵام دەداتەوە . ئێمە لەوە و پێش ئەمەمان لەتورك بینیوە .

لاهوتی خان بەو پێیەی لەهەڵەبجە هەڵوێستی ئێمەی بەدڵ نەبوو هەر سور بوو لەسەر ئەوەی کە ئێمە لە دەوڵەتی عوسمانی بمێنینەوە . لەو دوو ماڵە کە قسەی عەشایەری هەمەوەندی گوێ لێبوو هەڵوێستی گۆڕا ، شەو خۆی دزییەوە ، چەندمان کرد نەمان دۆزییەوە . لەکاتی خۆر کەوتن لە چەمچەماڵەوە بەرەو کەرکوك دەرچووین . لەنزیك کەرکوك لەسەر کانیاوێك وچانمان گرت . ئیسماعیل خان موجاهیدمان بۆ کەرکوك نارد تا جێگا و ڕێگامان بۆ دیاری بکات . شەومان لەشوێنی خۆمان بەسەر برد . بۆ بەیانی لە دەروازەی کەرکوك نزیك بووینەوە . شوێنی ئێمە قوتابخانەیەکی پیشەسازی بوو ، شوێنی سوارەکانیش لەسێ شوێنی ناو شاردا بوو ، جگەلە دووری شوێنەکەیان هیچ عەیبێکی تری نەبوو .

سەعاتێکی مابوو بۆ ڕۆژ ئاوا بوون بینیم سەر و سەکوتی لاهوت خان لەگەڵ دوو سواری هەمەوەنددا دەرکەوتن ، لەگەڵ یەکێك لە سوارەکاندا هاتە سەرەوە و نامەیەکی دایە دەستم . بینیم نامەکە لەلایەن مەحموود خدرەوەیە کەبۆ شەفاعەت بۆکردنی بۆی نووسیبووم .

بۆم دەرکەوت کەهەر ئەو شەوەی لە ئێمە جیا بۆتەوە ڕۆیشتووە بۆ ماڵی موشیر ئاغای کوڕی محەمەد سلێمان هەمەوەند ، ئینجا لەوێشەوە بۆ ماڵی

مەحموود خدر ڕۆیشتووە ، چونکە شەوی پێشوو مەحموود خدر لای ئێمە قسەی بە عوسمانییەکان دەکرد . لاهوت خان وای ئەزانی کەمەحموود خدر لایەنگری ئینگلیزەکانە ، بۆیە داوای لێ ئەکات کەیەکێکی شارەزای لەگەڵدا بنێرێ تا بیگەیەنێتە سەربازگەی ئینگلیزەکان . مەحموود خدر پێی ئەڵێ : مەگەر چی خراپەیەکت لە سردار مقتدر بینیوە ، کە ئەتەوێ لێی جیا بیتەوە و بچیتە پاڵ ئینگلیزەکان . دیارە خۆت کەسێکی خراپیت . لەگەڵ ئەوەیا کەسەربازگەی ئینگلیزەکان پێنج سەعات ڕێگا زیاتر نییە ، بەڵام کاری وا ناکەم ئەگەر لەماڵەکەی خۆمدا نەبویتایە بەدەست بەستراوی تەسلیمی عوسمانییەکانم ئەکردی . بەڵام ئێستا مەجبوری کە دیسان بۆ خزمەتی سردار مقتدر بگەڕێیتەوە . بەنابەدڵی لەگەڵ دوو سواردا گەڕاندییەوە و نامەیەکی دۆستانەشی لەشەفاعەتیدا بۆ نووسیبوو . نامەکەم خوێندەوە و پێم گووت : ئەم شێتییەی تۆ تازە نییە . بەعاجزییەوە داوای لێکردم کەنامەکەی مەحموود خدری بدەمەوە وتم : ئەزانم لەوە ئەترسێی کە پێشانی عوسمانییەکانی بدەم ، بەڵام بۆ خۆت ئاسوودەبە کەمن کاری وا ناکەم [٢٧] .

---

[٢٧] کەریم سنجابی ، خاطرات علی اکبرخان سنجابی ، ایل سنجابی و مجاهدات ملی ایران ، تهران ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ، لاپەڕە ٥٤٨-٥٤٩-٥٥٠ .

## جوامێر ( جووکل ) کێیە ؟

**خێڵـی هەمەوەنـد یەکێکـە لـە خێڵـە ناودارەکـانی کوردسـتانی باشـوور ، لـە ڕووی ئازایـەتی و خۆڕاگرییـەوە شـوێنێکی تایبـەتی و نـاوێکی دیاریـان لـە مێژووی کوردا هەیە . ئـەم خێڵـە پیـاوی سـوار چاك و چالاك و نەبـەز و دەم ڕاسـتیان زۆر بـووە ، یـەکێك لەوانـە جـوامێر ئاغـای هەمەوەنـدە کـەزۆر جـار بەجووکل هەمەوەند ناو دەبرێت . جـوامێر کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی حەمـەی جوامێری یەکەمەو سەر بـەتیرەی بەگزادەیـە . تیـرەی بـەگزادە گـەلێك پیـاوی سـوار چـاك و سـەرکردەی مەیـدانی وەك (چـەلەبی قـەدیمی هەمەوەند ، شەریف چەڵەوی ، فەقێ قادری هەمەوەند ، کەریم بەگی فـەتاح بەگی هەمەوەند ، سابیری کەریم بەگ ) یان تێدا هەڵ کەوتووە .**

**جـوامێر شـوێن و سـاڵی لـەدایك بـوونی ڕوون و دیـار نییـە ، ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باروو دۆخەی کە خێڵی هەمەوەندی تیا ژیاون ، چونکە هەمیشە لە جەنگ و کۆچ کردنـدا بـوون ، بـەڵام پـێ دەچـێ لـەنێوان سـاڵانی (١٨٣٥.ز – ١٨٤٠.ز ) لـە ناوچـەی چەمـچەماڵ لـەدایك بووبێـت . هەرلـە هەڕتی لاویدا نمونەی سوار چاکی و ئازیـەتی پێـوە دیـار بـووە، کەئازایـەتی یەکـەی لـە سـنور بـەدەر و نائاسـایی بـووە هەمیـشە دژایـەتی عوسمـانی و قاجارەکانی[٢٨] کردووە و ڕۆڵی بەرچاوی دژی ئەو داگیر کەرانە بینیوە ، تـا ئەو کاتەی لەلایەن ناسرالدین شـاوە لـە سـاڵی ١٨٨١.ز دا قەسـری شـیرین و ناوچەی زەهاوی پێ بەخشرا ، ماوەی حکوم کردنـی هـەتا سـاڵی ١٨٨٦.ز خایەنـد . جوامێرلەلایـەن خێـڵ و پیـاوە نـاو دارەکانـەوە چـەند ژنێکـی پێـشکەش کـراوە . مـیر عـەلی خـان کـەبرای ئـەبو قـەدارەی والی لوڕسـتان**

---

[٢٨] قاجارەکان لە بنەڕەتدا بەشێکن لەتورکی تەتەر .ئەم خێڵە ماوەیەکی دووروو درێژ لە وڵاتی شام و سوریا دادەنیشتن . لەزەمانی تەیمور لەنگدا هاتن بۆ ئێران . ئەم خێڵە لە ئازایەتیدا بەناوبانگ بوون . شاعەباسی گەورە بۆ مەنعی پەلامار دانی تورکمان ئەم عەشیرەتەی بە سێقۆڵ بەش کرد بەشێکی لە (مەرو) ، بەشێکی لەسنوری (بورجستان) و بەشەکەی تری لە (ئەسترئاباد) و (مازندەران) دامەزراند .

بوو ، کچێکی خۆی بەناوی فاتمە سوڵتان پێشکەش دەکات ، ئەویش مارەی دەکات و دەیخوازێ، هەروەها تایەفەی قەڵخانیش کچێك بەناوی زەینەب پێشکەشی دەکەن ئەویش قبوڵی دەکاو دەیخوازێت . پاش ئاشتەواری و ڕێکەوتن لەگەڵ خێڵی (نەدا) کە خێڵکی عەرەبن ، شوێنی دانیشتنیان دەکەوێتە سنوری پارێزگای باقوبەوە ، لەلایەن شێخی (سەرۆك) ئەو خێڵەوە دوو ژن پێشکەش بەجوامێر دەکرێ ، ئەویش یەکێکیان بۆخۆی مارە دەکاو ئەوەکەی تر کەناوی (وەشنە) دەبێ لە (چاوشین کوڕی حەمەڕەزا) ی سەفەرەوەند مارە دەکات . دوای مردنی چاوشین ئەوە بوو ئەحمەوە ڕەشی برای مارەی دەکات ، شێر خان باوکی ( عەلی ئەکبەر خان و قاسم خان ) یش لە خێڵی سەنجاوی کچێکی خۆی کەناوی (بانۆ خان) دەبێ پێشکەش بە جوامێر دەکات، ئەویش مارەی لە حەمە ڕەش دەبڕێ . حەبیب بەگی باوەجانی کچێك پێشکەش بەجوامێر دەکات ئەویش مارەی لە کاکەوڵا عەزیز دەبڕێ .

جوامێر پاش نەمانی خۆی سێ کوڕ و سێ کچی لێ بەجێ ما ئەوانیش : حەمەخان ، حەمە شەریف ، حەمە رەشید ، گوڵعوزار، جەهان، زەینەب . حەمە رەشید بەسوار چاکی وئازایی ناوی دەرکرد، ئەوە بوو لە شۆڕشی شێخ مەحموودا بەشدار بوو ، هەروەها یەکێك بوو لەوانەی کەشێخ مەحموود ڕاوێژی پێکردووە[٢٩] . لە شەڕی دەربەند بازیاندا لە ساڵ ١٩١٩.ز دا شەهید بوو . تەنانەت جەنازەکەشی نەدۆزرایەوە . جەهان خان کە بە جەهانە ڕەش ناسراو بووە ، یەکێك بووە لەو ژنانەی کەسەرکردایەتی سەد سواری هەمەوەندی کردووە . مامۆستا پیرەمێرد دەڵێ :

هەتا جـــوامێر دەنگی دلێـر بوو
تیپی هەمەوەند ژنیشیان شێر بوو

---

[٢٩] مامۆستا ڕەسوڵ هاوار ، کتێبی شێخ مەحموودی قارەمان ودەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، لەندەن ، ساڵی ١٩٩١.ز ، لاپەڕە ٨٣٥ .

حاجی سەیاح لە نووسین و یادەوەرییەکانیدا باسی ڕۆیشتنی خۆی بۆ قەسری شیرین وماڵی جوامێر دەکات. لەبارەی کچەکەی جوامێرەوە دەڵێ:
گفتند ﴿ دخترش با صد سوار حاضر بجنگ میشود ﴾[٣٠]
واتە : کچەکەی جوامێر بە سەد سوارەوەئامادەیە بۆ شەڕ .
جمال بابان لە باسێکدا ناوی سێ ژنی هەمەوەندی هێناوە ، ئاهوی کچی عەول قادری ڕێحانی سێتە بەسەر، فەقێ پیرۆزەی خاڵە ، جەهان کچی جوامێر . ئەم ژنانە لە گوێ بڕینی یەك تابور جەندرمەی عوسمانیدا بەشدارییان کردووە ، پاشان ئەم تابورە ناونرا تابوری گوێ بڕاو[٣١] .
جارێکیان محەمەد پاشای داغستانی[٣٢] لەلایەن جوامێرەوە دەعوەت دەکرێت ، ئەوکاتە جوامێر ماڵی لەداریکەلی دەبێ ، چونکە پیاوێکی سەغی تەبیعەت بوو ، شەست حەیوان سەر دەبڕێت . محەمەد پاشا لەمە زۆر دڵگران دەبێت ، کاتێ کە دەگەڕێتەوە لە ماڵی فەقێ قادری هەمەوەند لە چەمچەماڵ لادەدات . باسی ئەو مەقام و نانەی جوامێر دەکاو دەڵێ :

[٣٠] حەیدەر بهتۆیی کورد و پراگندگی او در گسترده ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ هەتاوی ، لاپەڕە ٢٤٠ .

[٣١] جمال بابان ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ئاوڕێك لەمێژووی هەمەوەند ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٧.ز ژمارە ١١٤ .

[٣٢] محەمەد فاضل پاشای داغستانی لە پیاوە ناودارەکانی سەردەمی عوسمانی ، چاکترین کەس و بەڕەوشت ترین کەس بوو . محەمەد پاشا لە ساڵی ١٢٦٠ کۆچی لە یەکێك لە شارەکانی داغستانی سەر بە قەفقاسیا لە دایك بووە . دەرچووی کۆلێجی سەربازییە لە (بطرسبورك) لە ڕووسیا . دوای داگیر کردنی داغستان لەلایەن ڕووسیاوە ، ئەویش بەرەو ئەستانە هەڵهات . سوڵتان عەبدولحەمید لە کۆشکی شاهانە کردییە پاسەوانی تایبەتی خۆی . ژنەکەی خەڵکی تورکیا بوو . بەهۆی ئەو ئازایەتییەی کەهەی بوو ، لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە پلەی پاشایەتی پێدرا ، ئینجا ڕەوانەی عێراق کرا بۆ لەناو بردنی عەشایەرە یاخی بووەکانی فورات ، کاتێك بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە . سوڵتان داوای لێکرد چی وڵاتێك هەڵئەبژێری بۆ مانەوەی خۆی ، ئەویش بەغدای هەڵبژاردوو لە ساڵی ١٣٠٠ کۆچی هاتە بەغدا و وەك والی دەست بەکار بوو ، لەساڵی ١٩١٥.ز لە کوت لە شەڕی دژی ئینگلیزەکاندا کوژرا .

ئەوەی من لە جوامێرم بینـی ، نیشانەی مـەغرووری بـوو ، یـا ئـەوەتا هێـز و دەسەڵاتی خۆی بەرامبەر ئێمە نواند .
فەقێ قادریش دەڵێ : ئـەوە داب و نـەریتی عەشـایەرییە نـابێ لـەوە دڵگـران بیت . جوامێر پێش خوانێکی عەرەبی هەبوو کەناوی (خومەیس) بوو . ئـەم پیاوە لەکاتی نان هێنان بۆ دیوە خان ، شمشێرێکی دەگرتە دەست و پـێش سـینیە نانـەکان دەکـەوت ، لەگـەڵ ڕاوەشـانی شمـشێرەکەیدا کـە بریـسك و باسکی دەدا دەکەوتە هۆسەکردن و دەی وت : تەنها جوامێرو بەس .

## قەڵاکانی جوامێر

جوامێر بەپێی دەسـەڵات و ئـەوە ڕۆژگـارەی کەتێیـدا ژیـاوە چـەند قەڵایـەکی پتـەو و قـایمی دروسـت کردبـوو ، ئەمـەش لـە ڕووی کـاری سـەربازییە وە گرنگـی خـۆی هـەبوو لـە ڕووی کۆمەڵایەتیـشەوە دروسـت کردنـی قـەڵا لـە شوێنە بەرزەکان ، هەیبەت و نیشانەی دەسـەڵاتی بە کەسـانی ئـەو شـوێنە دەبەخشی .
جـوامێر لـە وڵـاتی عوسمانیـدا چـەند قەڵایـەکی هـەبوو یـەکێك لـەو قەڵایانـە لەگوندی داریکەلی ناوچەی بازیان بوو ، هەروەها قەڵایـەکی تـری لـە گونـدی عـەلی مەنـسوری نزیـك چەمـچەماڵ لەسـەر بەرزاییـەك کـە دەیڕوانیـە سـەر ناوچەکەدا بەخشت و قوڕ دروست کردبوو ، کەجێی خۆیی و براکانی بوو .
لە گوندی قاسم بەگزادەش لە شوێنێکی بـەرز کـەپێ ی دەڵـێن (بانـە برسـی) قەڵایەکی مەحکەم و پتەوی دروست کردبوو، کەدەی ڕوانیـە سـەر باسـەڕەو بەرامبەر بە گوندی گەڕاو بوو .
لە سەردەمی قاجارییەکاندا لە ساڵی ١٨٧٩.ز لـە باشـووری قەسـری شـیرین بەدووری چوار سـەد مـەتر لەسـەر تەپۆلکەیـەك کەبەسـەر ڕووبـاری ئەڵوەنـدا دەیڕوانـی ، قەڵایـەکی بـە درێـژایی دووسـەد مـەتر و پانتـایی سـەد مـەتر لـە لایەن جوامێرەوە دروست دەکرێـت . شـوێنەواری ئـەم قەڵایانـە تـا ئێـستاش

هەر ماون . یەکێك لەفەرمان ڕەواکانی ئەو کاتەی عوسمانیەکان باس لەوە دەکا ، کەجوامێر خۆیی و سوارەکانی هێرش دەبەنە سەر لەشکرێکی عوسمانی، چەك و کەرەسەیەکی سەر بازی زۆریان دەست دەکەوێ ، ئینجا بەرەو ئێران هەڵدێن و لەو قەڵایە جێگیر دەبن کەدواتر بەناوی جوامێرەوە دەناسرێت[٣٣] .

## لە قەرەتە پەوە بۆ کەرکوك

بارۆند ئێدوارد ئۆڵد سی پاسەوانی سەربازی لەگەڵدا بوو ، هەروەها پەنجا ئەسپ سواری کورد کەهەر دەکەسیان سەر بە خێڵێك بوون ( داوودە ، هەمەوەند ، زەنگنە ، شارەزووری و جاف ) لەگەڵ نزیکەی دەرزەنێك چەرکەسدا ، بەم جۆرە باس لەگەشتەکەی خۆی دەکات .

ئێوارەی (٩ ی مایس) گەیشتمە قەرتەپە ، ئەم ناوچەیە هیچ گومانی لێ ناکرێ کەناوچەیەکی کوردییە . من لەلایەن دانیشتوانەوە وەك دۆست و ئاشنایەکی ناسراو بەگەرمی پێشوازی کرام ، هەروەکو بۆیان باس کردم هەموو کوردەکان لەلایەن سەرۆك و ئاغاکانەوە ڕاسپاردرا بوون هیچ جۆرە دیاری و بەخششێك لەم وەرنەگرن چونکە من دۆست و میوانی هەموو خێڵەکانم هەروەها تکایان لەمن کرد هیچ دیارییەك نەدەم بەکەس ، چونکە ئەم جۆرە کارە فێری شتی ناڕەوایان دەکات . دووسەعات پێش ئەوەی بگەمە قەرەتەپە لە سەرپردی نارین سوو دە ئەسپ سواری هەمەوەند لەناویاندا کوڕە بچوکەکەی جوامێر ئاغا دەرکەوتن .

خدر ئاغا ئەم خۆشەویستە بچکۆلەیە کە سیانزەساڵی تەمەنی تەواو نەکردبوو سواری ئەسپێکی چەموش و سەرکێش بووبوو شانازیی و خانەدانیی لەناوچەوانیا بەدی دەکرا . تفەنگێکی سەربازی قورسی لەشان

---

[٣٣] نەریمان سوبحانی ، کتێبی شهر باستانی قصرشیرین ، کرماشان ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ، لاپەڕە ٥٣ .

کردبوو لەبەریدا پشتی چەمابووە وە . بە داخەوە ئەم سوارە گچکە مێرد مندالـە دەسـەلاتی بەسـەر ئەسـپە سەرکێشەکەیدا نەدەشکا ، بۆیـە چـەند ڕۆژێـك دواتـر ڕووداوێکـی دڵتـەزێن ڕووی داوە . ئـەم ئەسـپە سـڵی لەسوارەکەی نەکردۆتەوە و سواریش ئەسپەکەی پیٚ نەگەڕاوەتەوە و بۆیە ئەسـپی تـایین گوڕەمبـازی داوە و پـڕ بـەدەم قـەپی لـەسمتی سـوارێکی ئەسپێکی تەنیشتییەوە گرتووە و تاوەکو چەند ئەسپ سوارێکی تر فریایی کـەوتوون و ئەسـپی تایینیـان دوور خستۆتەوە و کابرای قەپ لێگیراویـان ڕزگار کردووە ، بەڵام پاش چی ؟ ئەسپە چەموشەکە پارچە گۆشتی زلی لـە پـشت و سمتـی سـوارەکە کردبـووە و ئەمـەش تووشـی خـوێن بـەربوونی کردبـوو پـاش چـەند سـەعاتێك بـەهۆی برینەکانییـەوە گیـانی لەدەسـت داوە[٣٤]. هـەروەها ئـەوە دەگێڕێتـەوە کـە لـە نزیـك تـاوغ (داقوق) ئیسماعیل بـەگی سـەرۆکی بـاڵێکی خێڵـی داوودە . ئـەم سـەرۆك خێڵـە نزیکـەی ٨٠٠ تفەنگچی لە ژێردەستدا بوو ، لـە گونـدێکی سـەر ئـەم ڕێگایـە دەژیا و لـەویٚ بۆ قاوەخواردنەوە بانگی کـردم وپێـی وتم : جـەنابتان بێگومـان بیستوونانە دووسەعات لەمەو بەرتەقە لە کاروانێك کـراوە و دوو کـەس و سـیٚ حوشتری لیٚ کوژراوە و بەتـەواوەتی ڕووت کراونەتـەوە ، هـەروەها لەسـەری ڕۆیـشتوو وتی : ئەمە هەرکاری هەمەوەندەکانە ، چونکە هەر ئەوان ئەو دەستە ناپاکـە ئەوەشـێنن . پیـاو دەتـوانیٚ بەئاسـانی لـەوە دڵنیـابیٚ کەهەمەوەنـد خەریکـە دیسانەوە کاری ناڕەوا دەست پیٚ ئەکاتەوە .

ئەو قسانە وای لێکردم لەڕوو دابمێنم، چونکە دە پیاوی هەمەوەندم لەگەڵدا بوو ، هەوڵمدا دان بەخۆمدا بگرم ، ورتە لەدەمم نەیەتـە دەرەوە ، بـەڕاماویی وەك درەختی وشك بوو لەسـەر قالییەکـە دانیشتبووم و شـانم خستبۆ سـەر سـەرینەکە و جووڵـەم لـەخۆم بڕیبـوو . ویـستم بـەم ڕواڵەتـەم نیـشانی بـدەم

---

[٣٤] باڕۆن ئیدوارد نۆڵد (وەرگێڕانی دکتۆر حەمید عەزیز) گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ١٧-١٨ .

کەمن هەرچی سەر ئەهێنم و ئەبەم لەم جۆرە کارانە تێ ناگەم و نازانم چی بڵێم ، ئیسماعیل بەگ زۆر ئاسایی کێشەکەی بۆ باس کردم و لەسەری ڕۆیشت : جەنابتان دەبینن بەندەیەکی دڵسۆزی دەوڵەت و سوڵتان عەبدولحەمید هەموو کاتێك ئەوپەڕی کۆششم کردووە و هەوڵمداوە ئەمنیەت و ئاسایشی ئەم ڕێگا و بانە بپارێزم ئەم کۆششەش زۆر گران لەسەرم کەوتووە قوربانیم داوە ، کەچی کاربەدەستانی تورك بەمە نازان و ناعەداڵەتییان بۆتە مایەی ئەم کارەساتانە و ئەم جۆرە ڕووداوانەیان لێ دەکەوێتەوە بێگومان سوڵتان ئاگای لەمانە نییەو لەمەدا بێ گوناهە بەڵام من درێغی ناکەم و چیم لەتوانادایە و چیم لەدەست بێ بەباشی دەیکەم . هەرکەهەواڵی ئەم ڕووداوەم بیست یەکسەر کەوتمە خۆم و خۆم بۆ ڕاوکردن و دەستبەسەر کردنی ئەم چەتەو ڕێگرانە ، بۆئەم مەبەستە ٤٠٠ چەکدارم لەگەڵ خۆمدا برد . بەداخەوە ئەم جارە زۆربەی هەرەزۆری چەتەکان ڕزگاریان بوو ، بەڵام بەهۆی تیژڕەوی ئەسپەکەم توانیم ڕێگا لەتاقمێکیان بگرم و پێشیان پێ بگرم و سەرکردەکەیان بە گوللەیەك سارد بکەمەوە . ئەوەی کوشتم یاقوب ئاغای زاوای دەوڵەتیاری یاوەرتە کەلێرە لەگەڵتدایە . لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیە دەوڵەتیار ڕاپەڕی و پەلاماری تفەنگەکەی داو نەڕاندی : چی ! گەماڵ ئەمەشت کرد ؟ یاقوبی زاوامت کوشت . خۆشبەختانە لەم شوێنەدا کەسانی بێلایەن هەبوون و کەوتنە نێوانەوە و نەیان هێشت هیچیتر کوشتار و خوێن ڕشتن لەنێوان هەمەوەند و خێڵی داوودەدا ڕووبدات .ماوەیەکی دووروودرێژ ئەم شانۆ مێشك خۆرە خایاندی و کێشای ، بەڵام من نامەوێ هیچیتر خوێنەری پێوە بێزار بکەم . لە کۆتایدا ئیسماعیل بەگ وتی : جەناب من تەنیا بەسەرهاتەکەم عەرز کردی ئەمەش ئەو تاڵانەیە کەمن لەچەتەکانی هەمەوەندم سەندۆتەوە ، هیوادارم بەخاوەنەکانیان بدەیتەوە . تاڵانەکە هی کاروانە ڕووت کراوەکە بوو ، من لێموەرگرت بۆئەوەی بیان دەمەوە ، ئەگەر چی من

زۆربــەی زۆری خاوەنــەکانیانم نەدۆزییــەوە . تاڵانەکــە بریتــی بــوو لــە سـەعاتێکی زێـڕ و قۆردۆنێـك ، ملوانکەیـەك ، سـینییەکی زیـو ، هـەروەها چـەقۆ و چـەتاڵ و کەوچـکی سـەفەر و باخـەڵ و کیسـەی پۆسـتە و کاغـەز و دەپارچـەی زیـو و لەگـەڵ چـەند شـت و مـەکێکی تـر کـەهی ئەفسـەرێك بوون وەك:نیـشان و ڕووتبـەی سـەر شـان ، دەسـت کـێش ، شـتی دیـاری ، وەك دوایی ساخبووەوە ئەمانە شمەکی ئەو ئەفسەرەبوون کە ڕووتیان کردوون ، بەڵام ٣٠٠ لیرە زێڕەکەی ناو جانتاکەی ئەفسەرەکە بێ سەروو شوێن بوون و کەس نەیئەزانی کەوتوونەتە چی گیرفانێکـەوە . ئەفسـەرەکە زۆر دڵخـۆش بـوو کـەمن هەنـدێ لەشـتەکانیم بـۆ وەرگرتۆتـەوە . ئینجـا بـۆی بـاس کـردم ئەگــەر چــاپوکی و تیــژڕەوی ئەســپەکەی نەبوایــە ئــەوا بەســەلامەتی نەئەگەیشتە توزخورماتوو بـە گوللەیـەکی چـەتەکان دەپێکرا . ئـەوی ڕاست بێ ویـستم پێـچە بەدەورەیـەك بکـەم چـەند کیلۆمـەترێك بـە پـشت چیاکەدا بڕۆمە ئەوبەر بـۆ دیتنـی لاشـەی ئـەو هەمەوەندانـەی گوایـە کـوژراون و بزانم ئـەیان ناسمـەوە. لـە دواییـدا ئـەم کـارەم نـەکرد ، وتم پێویـست ناکـات چیتر خـۆم لـەم ڕووداوە هـەڵقورتێنم و هەنـدێ کەسـیش پێیـان وتم ڕێگاکـە بـۆلای لاشەی کوژراوەکان سەخت و ناخۆشـە ، نەچـی باشـە . ئیتر بڕیـارم دا ئێـرە بەجێ بهێڵم ، ماڵئاواییم لە ئیسماعیل بەگ کرد . لە کاتی بەڕێکردنمدا ئـەم بەگـە زۆر لەبـەرم پاڕایـەوە و تکـای لێکـردم لـەلای کاربەدەسـتانی کـەرکوك هەوڵی بۆبدەم کوڕەکەی کەسالێکە لە کەرکوك گیراوە بەرەڵا بکرێت . ئەوەی لێرەدا دڵ گەرمی کردم ئەم قسەیە بوو : ئـەم بەگـە بـەو دڵسـۆزییە ئیش بـۆ دەوڵەتی عوسمانی ئەکات و ئەم ڕێگاو بانە گرنگـە ئـەپارێزێ و ئێشکەی لێ ئـەگرێ ، کەچـی کاربەدەسـتانی دەوڵـەت کوڕەکـەیان گرتـووە و لـە زینـدانـدا قاییمیـان کـردووە . هێنـدێکی تریـشم پێمـاوە بیڵـێم بـەڵام ئێـستا نـا لـە شـوێنێکی تـردا باسـی ئەکـەم . دوای ئـەم وتـو وێـژە ملـی ڕێگـام گرتـەوە بـۆ ئـەوەی بگەمـە کاروانەکـەم کـە ماوەیـەك پـێش مـن کـەوتبووە ڕێ . لێـرەدا

ئەمەویٚ ئەم گریٚ کویٚرەیە بۆ خویٚنەر بکەمەوە و ڕاستی کیٚشەکەی بۆ بخەمە بەردەم : لەدوایدا بۆم دەرکەوت ئیسماعیل بەگ خۆی ڕیٚ گرییەکەی کردووە و ، خەڵکەکەی کوشتووە و کاروانەکەشی ڕووت کردۆتەوە . هەمەوەندەکان لەم کارە بیٚ خەبەر بوون و دەستیان تیٚدا نەبووە نە لەدوور نە لە نزیك . هەندیٚ قەباڵە ساخیان کردووە و کە ئیسماعیل بەگی داوودە چەتەکە بووە هەردوو کاروانی ڕووت و تاڵان کردووە ، بۆ نمونە جۆری ئەو تفەنگەی خۆیی و پیاوەکانی پیٚیان بووە جگەلەمەش چەند کەسیٚکی کاروانە ڕووت کراوەکە چەتە و ڕیٚگرەکانیان ناسییەوە . ئەو شتانەی ئیسماعیل بەگی داوودە دەربارەی ڕووت کردنەکە بۆی باس کردبووم ناڕاست بوون و خۆی هەڵی بەستبوون . دەربارەی کوڕەکەی کە لە کەرکوك زیندانی کرابوو ، ئەم کوڕە بە کوشتنی سیٚ کەس تاوانبار کرابوو ، بەڵام خۆی حاشای ئەکرد و ئەی وت : ئەمە کای کۆنە بەبا ئەکریٚت و بەهۆی شتی کۆنەوە کە پیٚشتر ڕوویداوە دوژمنەکانی پەلیان پیٚ گرتووە و ناچاریان کردووە شت بکات ، ئەگینا ئەو بیٚ خەتایە دەستی لە هیچدا نەبووە . گوایە هەمەوەندەکان ئەم ڕووداوانەیان کردووە بە بەڵگە و بیانوو بۆ ئەوەی لە ئەستەمبوڵ باس بکریٚن و بخریٚنە بەردەست و بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت ڕوون ببیٚتەوە کە خەڵکی تر خراپە ئەکات و هەمەوەند تیایدا پیاو خراپ ئەبن ناویان بەخراپی دەر ئەچیٚ . کردەوەی خراپی خەڵکی تر شانی ئەوان ئەگریٚتەوە و دەستە چەوری خەڵکی تر لە شانی ئەمان هەڵئەسوریٚن[٣٥] .

---

[٣٥] باڕۆن ئیدوارد نۆڵد (وەرگیٚڕانی دکتۆر حەمید عەزیز) گەشتیٚك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی یەکەم ، هەولیٚر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ٢٥-٢٦-٢٧ .

## شەڕەکانی جوامێر لەگەڵ عوسمانییەکاندا

جم و جووڵ و شەڕو شۆڕو گیروداری ئەم خێڵە جی ناکرێتەوە لەو بارو دۆخەی کەتیا ژیاون . ئەمانە لەسەر ڕێ و لەمەیدانی لێك هەڵپڕژانی عوسمانی و قاجارییەکانا بوون کەهەردوو لا وەك ئاسمان و زەوی لە سودی میللەتەوە دوور بوون و ئەوەی بیریان لێ نەکردبێتەوە بەرژەوەندی و سودی میللەت بوو وە . بوونی ناوە ناوەی میرنشینییەکانی ناوخۆ و پچڕانی شیرازەی کارو زوڵم و زۆری بێ سامان و زەبرو زەنگی نەبڕاوەی لەشکری بێگانە ، زەمینەیەکی لەبار بوو وە بۆ پەیدا بوونی جم و جوولی هەمەوەند و سەرهەڵدانی گەلێکی وەك (جووکل) و ، بۆ ئەوە کەهەمەوەند وا بیر بکەنەوە ئەگەر لەم هەراو شەڕی بێگانە و دوژمنانەدا خۆیان نەبن داکۆکی لە خۆیان بکەن ، لەژێر پێی ئەواندا ئەپلیشێنەوە . لەساڵی ١٨٦٢.ز کەدیان هەمەوەندەکانیان پێ نایاتە ڕەت ، ڕێگایان دان جارێکی تر بگەڕێنەوە ناوچەی بازیان. لەساڵی١٨٦٧.ز دا هەمەوەندەکان لەگەڵ نامیق پاشای والی بەغدا تێکچوون و پاش شەڕو هەرایەکی تر بەرەو زەهاو کشانەوە . جارێکی کەش کاربەدەستانی عوسمانی بەناوبژی کردنی خێر خواهان لەگەڵ هەمەوەندەکان ڕێکەوتنەوەو هەمەوەندەکان گەڕانەوە بازیان . لەسەردەمی مەدحەت پاشای والی بەغدا دا دوژمنایەتییەکە تازە بو وەوە ، والی مەفرەزەیەك لەشکری لەگەڵ (٥٠٠) سواری چەرکەسەدا ناردە سەریان ، بەڵام ئەم لەشکرە شکاو لەئەنجامی ئەوەدا ڕەئووف پاشا کەپاش مەدحەت پاشا بوو بوو بە والی ، لەگەڵیان ڕێك کەوتەوەو هەمەوەندیش گەڕانەوە بازیان و تا ساڵی١٨٧٨.ز دونیای هەمەوەند کش و مات بوو . پاش کوژرانی پیاوێکی ناوداری هەمەوەند لەلایەن زەنگەنەوە شەڕی نێوان هەمەوەند و زەنگەنە هەڵگیرسا[٣٦]. لە ئەیلولی ١٨٧٩.ز هەمەوەندەکان

---

[٣٦] مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عەبدولکەریم ، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ، لە چاپ کراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد ، بەغدا، ساڵی١٩٨٠.ز ، لاپەڕە ٤١ –٤٢

بەسەرکردایەتی جوامێر هێرش دەکەنە سەر قەرەداغ و قایم قامەکەی دەکوژن[٣٧] ، لەم شەڕەدا زەنگەنە شکان و داوای یارمەتییان لە سوپای عوسمانی کرد . عوسمانی بەچەك و سوارە لە خانەقینەوە یارمەتییەکی باشیان بۆ زەنگەنەکان نارد ، بێجگەلەوەی کە قایم قامی کفریش بە (٧٥٠) سوارەو بەشەڕ کەرانی تیرەی زەند و پاڵانی و هەندێ سوارەی تاڵەبانی و باجەڵانەوە هەڵیا کوتایەسەریان .

لەگەڵ ئەم عێڵجاڕی و عوسمانی جاڕییەشدا هەمەوەندەکان توانیان دوژمنەکانیان شپرزە بکەن و چەکیان بکەن و زۆریان لێ بەدیل بگرن و پاشان بەڕەڵاشیان بکەن .

دوای ئەم کارەساتە حکومەتی عوسمانی بەقومان دارێتی ئەدهەم پاشا هەشت و تابور پیادەو ئاڵاو نیوێك سوارەو ، تابورێ تۆپ چی کێوی ناردە سەریان و لە گۆپتەپە بەرەنگاری یەك بوون . هەمەوەندەکان لەو کاتەدا خەریکی پەڕاندنەوەی ماڵ و خێزانەکانیان بوون بۆ وڵاتی عەجەم ، لەو بارو دۆخە نابارەدا لەشکری عوسمانی هێرشی بردە سەریان ، بەڵام ئەمان هێشتا توانییان گەمارۆی هێزەکەی ئەدهەم پاشا بدەن و ئەدهەم پاشا خۆشیان بەدیل گرت ، کەچی دواییش بەڕەڵایان کرد و خۆیان بەرەو زەهاو ملی ڕێیان گرت . هەمەوەندەکان کە گەیشتنە زەهاو کردیان بە بنکەی خۆیان و دەستیان کرد بە بێزار کردنی عوسمانی و ئێران . لەسەر ئەمە هەردوو دەوڵەت بڕیاریان دا پێکەوە ئەم تیرەیە بەیدەست بکەن . ئەوە بوو ئێران لە هێزی نیزامی و تفەنگچیی تیرەکانی سەر سنوور نزیکەی (١٥) هەزار کەس و ، عوسمانیش هێزێکی زۆری لە دۆڵی سیرواندا کۆ کردەوە . هەمەوەندەکانیش ماڵ و منداڵەکانیان لە(عەلی پەکان) ی نزیك دۆڵی (عەباسان)حەشار داو خۆیان بەرەو حاجی لەر کشان بۆ ڕێگرتن لە ئۆردوی

---

[٣٧] نەجاتی عەبدوڵا ، کتێبی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵای نەهریێ لە بەڵگەنامەکانی فەڕەنسیدا ساڵی ١٨٧٩.ز –١٨٨٢.ز لە فەڕەنسی یەوە کردووە بەکوردی ، چاپی سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٤.ز

عەجـــەم و توشـــیان بـــوون و شـــکاندنیان تـــا مایدەشـــت هـــەڵیان بڕین ، تاڵانێکی زۆریان لێگرتن و بەرەو قورەتو و قەسری شیرین گەڕانەوەو لـەویٚ لێـی دانیـشتن . لـەکاتی ئـەم کارەساتـەدا فـەقیٚ قـادر لەبەندیخانـەی کەرکوك بەندی بووە .

## شەڕی جوامێر لەگەڵ مەحموود بەگی شێروانە

جارێك جـوامێر ئاغـای هەمەوەنـد کـە (جووکـل) یـان پێـدەووت ، لـە شـاخی حەســەن قـــولی خـــان بـــەخۆی و دەســـت و پێوەندییـــەوە یـــاخی دەبـــیٚ و دێهاتەکانی ئەوناوە تاڵان دەکاو دەیەویٚ بگەڕێتەوە بۆ بازیان .
(مـەحموود بـەگ) ی شـێروانە کـەپیاوێکی بەدەسـەڵات بـوو دەڵـیٚ واچـاکە لەگەڵ جوامێر ئاغا بجەنگم ، کەهیچ نەبیٚ نیوەی ئـەم تاڵانـەی لیٚ بسێنمەوە کـاتیٚ هـەردوولا دەکەونـە جەنگـەوە ، محمـود بـەگ دەشـکیٚ و جـوامێر ئاغـا ماڵی مەحموود بەگیش تاڵان دەکا ، لەو کاتـەدا شـاعیری کـورد شـێخ ڕەزای تاڵەبانی لەچەمچەماڵ دەبیٚ کەئـەم هەواڵـە دەبیـستیٚ ئـەم دوو دێـڕە شـیعرە دەڵیٚ :

جێگە جەنگی جووکل و مەحموود بەگی شێروانە بوو
ئافەرین مـــــەحموود بەگ لەم جەنگەدا شێر وانە بـوو
وەختیٚ قاسید هـــاتەوە لێم پرســـــی ئەم شـــــەڕە
وورده ورده بۆی بـــەیان کردم کەچی شیر وانەبـــوو[٣٨]

[٣٨] ئەم بابەتە لە نوسینێکی مامۆستا جمال بابان هاتووە ، ئەویش لە نامەیەکی نەجمەدین مەلا بۆ مامۆستا جمالی ناردبوو . باسی ئەم چیرۆکەی جووکل و مەحموود بەگ دەکات .
بڕوانەئاوڕێك لە مێژووی هەمەوەند . گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٧.ز ، ژمارە ١١٤ .

## جوامێر ئاغای هەمەوەند و شێخ سەعیدی شاکەل

جوامێری هەمەوەند ، جوامێر ئاغا ، جووکل هەمەوەند . ناوێکی ناسراوی کەرکوك و گەرمیان و ئەوبەری سیروانیش بووە . لەیەکێك لە لەشکرکێشییەکانی عەشایەریی ئەو دەمەی بۆسەر دێهات و ئێلاتی گەرمیان . ژمارەیەکی زۆر مەڕ و گا و گۆتاڵی ئەو ناوچەیە تاڵان دەکات و دەیخاتە پێش لەشکرەکەی بەرەو ناوچەکانی خۆیان لەدەورووبەری چەمچەماڵ . ئەوکات شێخ سەعیدی شاکەل . کە بەشێخ سەعیدەڕووتەی شاکەل ناسراوە . لەگوندی شاکەڵی ناوەندی دەشتی شاکەل نیشتەجێ دەبێت. ئەو پیاوێکی خواناس و دەروێش و خۆشەویستی خەڵك بووە ، لەبەر ئەوە ڕووی لێ دەکەن و داوا دەکەن هەوڵێك بدات بۆ وەرگرتنەوەی بەشێك لەو تاڵانییەی بەدەست جوامێر ئاغاوەیە .

شێخ سەعید بێ سێ و دوو بەتاقە سوارە دوای لەشکری هەمەوەند دەکەوێت و لەباکوری ئێستای شاری کەلارەوە دەگاتە یەکەم سواری لەشکرەکە ، کەپیاوێکی پۆشتە و پەرداخ و سواری ئەسپێکی چاك دەبێت . سوارەکە دەپرسێ ؟ خاڵە خێرە ؟ شێخ سەعیدیش یەکسەر پرسیاری لێدەکات ، بەدوای جووکل هەمەوەندا هاتووم لەکوێیە پێشانم بدە . سوارەکە ئیشارەت دەکات بۆ پێشەوەی لەشکر و ئەڵێ : ئەو وا لە پێشەوەی لەشکرە . شێخ سەعید تا دەگاتە دوا سورای پێشەوە هەمان پرسیار دەکات ، ئەوانیش هەمان وەڵام دەدەنەوە و تادەگاتە ئەو کەسەی لەپێشی پێشەوەیە و پرسیارەکەی لێ دەکات . سوارەکە لەوەڵامدا پێی دەڵێ : جوامێر ئاغا یەکەم سوار بووە کە ئێوە دیوتانە وا لەدواوەی لەشکر ، ئەگەر کارتان پێی هەیە بگەڕێوە بۆ لای . شێخ سەعید بەغاردان دەگەڕێتەوە سەرەتای لەشکرەکە . کە جوامێر ئاغا دەبینێ بەتووندی پێی دەڵێ : تۆ خۆت جووکل هەمەوەندی بۆ ئێمەت بۆ پێشەوەی لەشکرەکەتان ناردووە ؟!

جـوامێر ئاغـا کـە گـوێ بیـستی وتـاری شـێخ سـەعید دەبێـت یەکـسەر لەئەسپەکەی دادەبەزێ و بەگەرمی چاك و چۆنی لەگەڵ شێخ دەکا و دەڵێ : وەڵا قوربان بۆ تاقیکردنەوە بوو .

کەگەڕایتـەوە لامـان و بەهـەمان نـاوی (جووکـل) بانگـت کـردم . هـیچ نـەگۆڕابوویت ، منـیش بـۆم دەرکـەوت کـە تـۆ پیـاوی خـودای بەڕاسـتی . فەرموو ئەمر کەن . ئیتر هەموو تاڵانییەکەی پێ دەداتەوە[٣٩]

## جەنگی جوامێر لەگەڵ قاجارییەکان

لەو سەرو بەندەدا کە هەمەوەندەکان لە عوسمانیەکان یاخی بوون ، لەلایـەن ئێرانیـشەوە تەنگـە تـاو دەکـران . ئـەوەتا حکومـەتی ئێـران تەلـەگراف بەشیدەت بۆ حاکمی کرماشان لێدەداو پێ ی دەڵێ : یان دەفعی ئـەم قەومـە بکـە یـان سـەری خـۆت ، حـاکمی کرماشـان بـە پەلـە بـۆ سـەرتیپی کـەڵهوڕ دەنووسـێ هـەموو ئـەو عەشـایەرانەی کەڕوتبـەی سـەرتیپ و میریـان هەیـە بەقومانـداری عمـوم عەشـایەر جوانڕۆ و گـۆران ، کـەعیبارت بـوو لـە هەشـت سوڵتان و سوارەکانی زەنگنەو سەنجاوی و ئەحمەدەوەند بهتۆی ، هەروەها حەبیب بەگی باوە جانی و فەتاح بـەگ وەڵـەد بـەگی و عـەزیز بـەگی شـەرەف بەیانی ، ماباقی ئێڵـات بـە ئـەمری حکومـەت لـە مـەحاڵی زەهـاو بـەخێوەت و هەموو ڕم و تفەنگێکەوە ، کەڕەزاقولی خان سـەرتیپ و سـەردار ئـەم لەشـکرە بوو بە رەو ناوچەکە هاتن . ڕەزاقولی خـان نامەیـەك بـۆ جـوامێر دەنووسـێ و تیایـا ئـەڵێ : من وەك ڕۆژ وام کـەڕۆژ هـەڵهات شەمـشەمەکوێرە دەبـێ خـۆی وون بکات ، ئێستا هاتوومەتە زەهاو و فـەرمانم پـێ کراوە ، منـیش بـۆ خـوا پێت دەڵێم عیلاجی خۆت بکە  لە ئێران نابێ بمێنی ، ئەگینا ئۆباڵی هـەموو

---

[٣٩] نووسینی ئەم بابەتە لەلایەن مامۆستا محەمەد شاکەلی ، کە ئێستا وەزیری ئەوقافی حکومەتی هەرێمی کوردستانە ، لەمێژووی ٢٧ / ١٠ / ٢٠٠٧ دا بەدەستم گەیشت .

((نووسەر))

ڕوداوێـك دەكەوێتـە ئەسـتۆی خۆتـان . كاتێـك جـوامێر نامەكـەی بەدەسـت گەیشت ، پاش خوێندنەوەی نامەكە ڕوودەكاتە لایـەن گرانـی و دەڵـێ: ئـەم جارە وەك جارەكەی پێشووم لێ مەكەن ، چونكە ئەم جارە دەمەوێ چاوی هەموو عەشایەری ئەم ناوچەیە بشكێنم و واز هێنـانم نییە، ئینجا وەڵامی نامەكەی ڕەزا قولی خان دەداتەوەو تیایا دەنووسێ :

مـــن جـوانمرد جــهانـم

تیغ برندی فرق دشمنانم

هـەروەها دەڵـێ : من تـۆم وەك ڕۆژ نەبیستووە ، بەڵكو وەك هـەتیوی هـەتیو خانـەكانی كرماشـان ناسـیوە ، كوچـەك كارخانـەی خـوار سـەرپێڵ زەهـاو بەسەرتا بدرێ ئەگەر تەقسیر بكەی ، مۆری خۆی لەنامەكە دەداو بەقاسید دا بـۆ ڕەزا قـولی خـانی دەنێـرێ ، كاتێـك ڕەزا قـولی خـان نامەكـەی بەدەسـت گەیشت ، پاش خوێندنەوەی فەرمانی بەلەشكر دا لەگەڵ سوڵتانەكان قۆڵ بـەقۆڵ بەتــەپڵ و كــەڕەناوە بــەرەو مــەحاڵی شـێخان هــاتن . لــەم لاشــەوە لەشكری عوسمانی بەسـەر پەرشتی محمد پاشای داغستانی بـەرەو سنور كەوتە ڕێ ، هەردوو هێـز وارێـك كـەوتبوون ، كەلـە هەمەوەنـد بـدەن و تـەفرو تونایان بكەن . هەمەوەنـدەكان ماڵ و منداڵیان ئاگـادار كردبۆوە ئەگـەر لـەم شـەڕەدا سـەر نەكـەوتن هانـا بـۆ محمـد پاشـا بـەرن ، تـاكو داڵـدەیان بـدات . لەشكری ڕەزا قولی خان هەتا دەهات لێیـان نزیك دەبوو وەوە ، بەڵام هێـزی عوسمانیـــەكان چـــەند ڕۆژێـــك درەنـــگ تـــر گەیـــشتنە ئـــەو ناوچـــەیە . هەمەوەنـدەكان بـەپێی نەخـشەیەكی خۆیـان نزیكـەی چـوار سـەد سـواریان لەكەمین دانـاو لـە شـوێنێك پـێ ی دەڵێن (سیانا تـاوێر) ، هـەروەها نزیكـەی سـەد سـواریان لەبـەردەم لەشـكری دوژمـن وەسـتان ، تـا بـەدەم شـەڕەوە لەشكری دوژمن بەرەو ناو كەمین بهێنن ، تا لەشكری دوژمن وابزانـێ كەئـەم لەشكرە شكاوەو دوایان بكەون .

شەڕ تادەهات بەرەو دوا دەکشایەوە لە شکری دوژمنیش دوایان دەکەوتن .
کاتێك لەشکری دوژمن کەوتە قوڵایی کەمینەوە ، هەمەوەندەکان بەهەموو جۆرە چەکێك لێیان دان . ئەو ڕۆژە تا ئێوارە شەڕێکی گەورە ڕوویدا .
دوژمن ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو چوار سەد جەنازەیان لەمەیدانی جەنگ بەجێ هێشت ، ئەوانی تر هەڵهاتن . باروو بارخانەیەکی زۆر دەست لەشکری هەمەوەند کەوت ، کەزیاتر لە هەزار بار ئێستر بوو ، بۆ شەویش جوامێر وتی : واز ناهێنم تا زەبری گورچك بڕ لە ئێران نەدەم ، ئەوە بوو نزیکەی دووسەد سواری ئێشك گریان کوشت و بەرەو بارەگای ماڵیاس خانی جێگری ڕەزا قولی خان ڕۆیشتن . کاتێك لەشکری هەمەوەند گەیشتە بارەگاکانی ماڵیاس خان و هەندێکیشیان لەوان کوشت و ئەوانی تر هەڵهاتن ، هەر لەو شەوەدا ماڵیاس خان لەلایەن چەکدارەکانی هەمەوەندەوە کوژراو سەریان بڕی ، ئەم هەڵمەتە بەردەوام بوو تاگەیشتە سوپا بێشومارەکەی ڕەزا قولی خان ، کەبارەگاکەی لە (کەلی داود) ی سەرپێڵی زەهاو بوو . ئەوانیش بەتەواوی ورەیان ڕووخابوو بارەگاکانیان چۆڵ کردوو هەڵهاتن .
لەم شەڕەدا ژنانی هەمەوەند شان بەشانی پیاوەکانیان وەك پشتیوان بەشداری شەڕیان کردووە ، ورەی پۆڵاینیان بەبەرۆکی سوارەکاندا کردووە و بەدەنگی زوڵاڵەوە وتویانە :

سوارەی ترتان بۆ هات بەپۆڵاوە

بەتیر دەسمێ مەل بەحەواوە

هەمەوەندەکان بەدیل و دەست کەوتەکانەوە لە قوڵایی شەڕگەکانەوە گەڕانەوە . یەك دوو تۆپیان لە سەر عارەبانەیەك دامەزراند .
لەدار و پەڕۆ لە شێوەی جەستەی ماڵیاس خان (پەیکەر – کۆتەل) یان دروست کردوو سەری ماڵیاس خانیان پێوە لکاند ، لەگەڵ چەند کوژراوێکی تردا بۆ محمد پاشای داغستانییان نارد کە سوپاکەی

لـه هەمەوەنـدەكان نزيـك بـوو بـۆوە ، ئـەويش نيـازى هێـرش كردنـە سـەر هەمەوەندەكانى هەبوو. محمد پاشا كەئەم ديمەنە دەبينـێ ، ترس و گومان سـەرتاپا هۆشـى داگـير دەكـات ، ورەى لەشـكرەكەى زۆر دادەبـەزێ بۆيـە وڵـامى بـۆ هەمەوەنـدەكان نـارد ، كـەهێزەكانيان لەشـوێن خۆيـان بمێننـەوە بەخێرايى هەواڵى ئـەم شـەڕەى هەمەوەنـدەكانى بـە سـوڵتان گەيانـد ، ئەگـەر ئێمـە شـەڕ بكـەين هـەمان چارە نووسـى ئێرانمـان دەبێـت . كاتێك سـوڵتان ئەمەى بيست هەمەوەندەكانى عەفو كرد ، ئەوانيش بۆ بازيان و چەمچەماڵ هاتنەوە[٤٠].

ئـەوەى لـە دەستنووسـەكەداهاتووە نـاوى چـەند كـوژراوێكى هەمەوەنـدى هێناوە وەك : يادگار عزيز لەبەگزادە ، بەهرام عەلى لە سيێتەبەسەر ، فـەتاح خـــاتون لەڕەمەوەنـــد ، ئەحمـــەد قـــادر لـــە قەيلەســـوورى ، هـــەمزە لـــە سـەفەرەوەند ، حەمـەى زۆراب لـە هەمـەيل ، ئەحمـەد گوڵنـاز لـە گـل ، عـەلى ئەحمەد پيرەويس لە خێڵى حەمەڕەش .

## سەركوت كردنى هەومەوەندەكان
## لە لايەن قاجاريەكانەوە

جوامێر ئەحمەدەوەند چەلەبى كەلەگەڵ حكومەتى عوسمانيدا شير و تيريان لەيـەك دەسـوو ، بـەرەو كێوەكـانى بـە مـۆ هـەڵهاتن ، لەبـەر كـەمى ئازووقـەو نـەبوونى كـاروان لـەو ناوچـەيە بـەرەو شـاڕێى عێراقـى عـەرەب و كرماشـان هـاتن . زۆر بـەخراپى دەسـت درێـژيان دەكـردە سـەر كاروانـەكان و ڕوتيـان دەكردنەوە ، ئەوانـەى بەمەبەسـتى زيـارەت بـۆ شـوێنە پيرۆزەكـانى كەربـەلاو نەجـەف دەچـوون . هەرچـى ژن و منـداڵ و پيـاو هەيـە ئەوانـەى ، كـە مـاڵ و

---

[٤٠] دەست نووسەكەى حيدر عەزيز خەسرەو ئاغا .

پارەیان لەدەستدا بوو  پەنایان بۆ ملك نیاز خان کەرەندی هێنا[٤١]، ئەویش هەموویانی خستە ژێر چەتری حیمایەی خۆیەوە . ملك نیاز خان بەهۆی عەزیز خانەوە کەکاتبی فەوجەکەی بوو ، نامەی بۆ سەرتیپی سنورەکان نووسی و داوای لێ کردن کەسەربازەکانیان کۆ بکەنەوە بەرەو کەرەند بێن . لەم کاتەدا هەواڵ بە ملك نیاز خان گەیشت کەهەمەوەندەکان ناوچەی بەمۆو شێخان و هۆرێنیان داگیر کردووە ، هەرچی گوندەکانی ئەو دەوروو بەرەیە هەموویان تاڵان کردووە . ملك نیاز خانیش بەخۆیی و سەربازەکانیەوە بەرەو مەیدان چوون  پێش قەرەوڵ فەوجەکە شوێنی هەمەوەندەکانی لەچەم مورو گەیلان ڕاگەیاند ، ملك نیاز خان خۆیی و لەشکرەکەی بەرەو گەیلان ڕۆیی . کاتێ هەمەوەندەکان بە مەیان زانی بەرەو ئاغ داغ ڕۆیشتن، جاسوس هەر بەدوایانەوە بوون . ملك نیاز خان و محمد حسن خان سەرتیپی کەڵهوڕ لەگەڵ هەموو سەرکردەکانی تردا کەوتنە تاقیب کردنی هەمەوەندەکان ، پاش ماندووبونێکی زۆر لە کەناری ڕووباری ئەڵوەن بنەو بارگەیان خست. ملك نیاز خان بڕیاری دا هەر کەسێك شوێن و جێگای هەمەوەندەکان دەست نیشان بکا، لە باجی حەوت ساڵماڵییات عەفو دەکرێ ، یەکێك لە نیاز مەندەکان بەپڕتاو هاتوو شوێن و جێگای هەمەوەندەکانی لە ئاغ داغ دەست نیشان کرد ، لە بەرە بەیانێکی زودا ملك نیاز خان فەرمانی دا هێرش بکەنەسەریان و لەو ناوچەیە دەریان بکەن . هەمەوەندەکانیش پێش ئەوەی لە شکر بگاتە سەریان بەماڵ و کۆچەوە لە ڕووباری سیروان پەڕینەوە ، لەم سەرکوت کردنەی  هەمەوەندا ، فەرەج اللە خان لەگەڵ تیپێکی کەرەندی ، شاە موراد خان بهتۆیی لەگەڵ سوارەکانی ئەحمەدەوەند(هەمەوەند) و محمد حەسەن خان سەرهەنگی کەڵهوڕ لەگەڵ

---

[٤١] کەرەندی : شەش هەزار ماڵن لە ڕۆژئاوای کرماشان لەدەورروو پشتی کرند دانیشتوون وەلە پاتاق و پەشێوەو چەشمە سپی بڵاو بوونەتەوە .تیرەی کەرەندی چواردە بەشن : ﴿کەرەندی بیونجی ، رەشید عەلی ، جەلالەوەند ، پاتاقی، بایە جانی ئاینە ، جۆزگەیی ، سەرمیل ، هەلتەی ، بەری ، چەشمە سفیدی ،  خەسرەوبەهمەنی، نەسر ئابادی ﴾

سـوارەكانی كوێـستان ، هـەروەها عبـاس خـان ئەسـەدی و ئەكبـەر خـان سیاسیایی[٤٢] لەگەڵ سوارەكانی گەرمە سێردا هاوكاری ملك نیاز خانیان دەكرد.

## تەسلیم بوونی هەمەوەندەكان بە عومەر پاشا[٤٣]

لـە مەنزوومـەی جەنگـەكانی ملـك نیـاز خانـدا هـاتووە ، عومـەر پاشـاو تەقیەدین كەلە عێراق حوكمیان دەكرد ، جوامێر لەتاو ئەوان بەرەو ئێران هـەڵهاتبوو ، لـەم لاشـەوە لەلایـەن ملـك نیـاز خانـەوە تەنگـەتاو كرابوو ، ئەوەبوو ئەم جارە لەجیاتی شەڕ ، سیاسەتی بەكار هێنا . هەموو سوارەكانی لەچەك داماڵین و تەسلیم بە عومەر پاشا بوون .

سیاسـەتی ئـەو ڕۆژگـارە وای دەخـوازی ، كـە جـوامێر دیسانەوە پـڕ چـەك بكرێت . ئەوە بوو لەلایەن عومەر پاشاوە چەك و شوێنی ئارامیان بۆ دابین كـرا . ملـك نیـاز خـان كـەبینی حكومـەتی عوسمـانی چـۆن پارێزگـاری لـە جـوامێر و دارو دەسـتەكەی دەكـات هـەروەها ئـەو مـاڵ و كـەل و پەلانـەی كەلـەزیارەت كـەرەكان بـەتاڵان برابـوون ، لەلایـەن حكومـەتی عوسمانیـەوە بەسـەر هەمەوەنـدەكان دابەش دەكرێن ، ئەویش بەرەو شـوێنی خـۆی كـە پاتـاق بـوو گەڕایـەوە . ئـەو خێـڵ و تیرانـەی تـریش هەریەكـە بـۆ شـوێن و جێگـای خۆیـان چـوونەوە . حكومـەتی عوسمـانیش جـوامێری بـۆ قەڵاكـەی چەمچەماڵ نارد .

---

[٤٢] سیاسیایی تیرەیەكە لە كەڵهوڕ ، خێڵی كەڵهوڕیش زیاتر لە دە هەزار ماڵێكن لە ماهی دەشت و هارون ئاواو قەڵا شاینی و ناوچەی قەسری شیرین و كەرەند دا ئەنیشن بەشێكیشیان لە ڕۆستەم ستان و خور خورە و دەوروبەری سەقز لە ئێران نیشتەجێن ئەم خێڵە بیست بەشن

[٤٣] عومەر پاشا لە ساڵی ١٨٥٧.ز بووە والی بەغدا لەدوای ڕەشید پاشا، بەڕەگەز هەنگاری بوو ، ئەم عومەر پاشایە جارێكیان زۆر بەخراپی لە هەمەوەندەكانی دا ئەمەش بووە هۆی لابردنی .

## جوامێر و شۆڕشێکی تر

پـاش ماوەیـەك کـە جـوامێر نـاو و ناوبـانگی دەرکـرد ، ئـیتر گاڵتــەی بـە خەلیفـەکانی عوسمـانی و شـاکانی ئێـران دەهـات .لەوکاتـەدا کـەزۆرێك لـەو ماڵـە عەرەبانـەی بـۆ لـەوەڕگاکانی کوردسـتان هـاتبوون ، لەلایـەن جـوامێر و چــەکدارەکانییەوە تاڵــان دەکــرێن و هەرچــی خێوەتیــان هەیــە هــەمووی دەسـوتێنرێت . هـەواڵی ئـەم تاڵـان کردنـەش لەلایـەن سـەرۆك هۆزەکـانی عەرەبەوە بە سوڵتانەکانی عوسمـانی گەیشت . لەئەستەمبوڵەوە تەلـەگراف بۆ بەغدا لێدرا کەجوامێرو سوارەکانی سەرکوت بکرێن ، جوامێر لەم هەواڵە ئاگادار بوو ، دیسانەوە بەرەو ئێران هەڵهات . کاتێـك هـەواڵی یـاخی بـوونی جوامێر بە ئێران گەیشت ، ملك نیاز خانیش خۆیی و سەربازەکانی کەوتنە سەنگەر قایم کردن و لە سنوری قەسری شیرین و بەمۆ جێگیر بوون .

جوامێر کەوتە ڕاویژ کردن لەگـەڵ دەستەو دایەرەکـەی ، چونکە لـە هـەردوو لاوە ئابڵوقـە درابـوون . وەسـێتی بـۆ سـوارەکانی کـرد تـەنها ڕێگـای ڕزگـار بوون ئەوەیە شەڕکردن تا مردن نەك ئەسیر بوون .

دەروێش کە برای جوامێر بـوو لەگـەڵ چەند کەسێکی گـەورەی خێڵ وەك : فـەقێ قـادری هەمەوەنـد ، مـەحموود زاری ، عـەزیز یادگـار ، حەمـە و لـەژێر سەرپەرشتی دەروێش بەرەو قورەتوو کۆچیان کرد .

لەشـکری ملـك نیـاز خـان کەوتـە تاقیبیـان تـا لـە شـێخان نیـشانیان دەسـت کــەوت و بارەگەشــیان لــە قورەتــوو ، کەهەمەوەنــدەکان زانییــان لەشــکری دوژمن لەو دەوروو بەرەیە ، ناچـار بـەرەو کێوەکـانی ئـاغ داغ کۆچیان کـرد. لە شـکری ئێـرانیش پـاش چـەند سـەعاتێك گەیشتە قـورە تـوو ، ئینجـا ملـك نیاز خان پرسیاری هەمەوەندەکانی لە عەزیز خانی باجەڵان کرد .

لە جوامێر نامەکەدا هاتووە لەم بارەوە کەدەڵێ :

وتی عەزیز خـان پێم بڵێ بەڕاستـی
هەواڵ هەمەوەن هەم شوێن و باسی
ئەگەر پێم بڵێی خۆت داوە نەجات
دەنا سوێند بەسەحرای عارەسـات
عێل و عەیالت هەم مـاڵ و سامان
دەکەم بەسمکۆی لەشکری ئێـران
سەرت لــەبەدەن دەبڕم بەجـــودا
دەیدەم بەدیـاری بیبەن بۆ پاشـا

کاتێـك عـەزیز خـان هـیچ هـەواڵێکی ئـەوانی نـەدەزانی ، ملـك نیـاز خـان کەسـەیری کـرد کـاری هەمەوەنـدەکان بـێ سـود بـوو ، بـۆ یـە بڕیـاری دا بـە لەشکرەکەی ، کە قورەتوو چۆڵ بکەن و بەرەو قەسری شیرین بگەڕێنەوە .

جوامێریش لەگەڵ ئەنجومەنی شورای خێڵ کۆ بوونـەوە ، ئینجا بڕیـاری دا لـە قـەڵای بـەمۆ جێگیر بێـت ، چونکە لـەو کاتـەدا فـەرمان ڕەواکـانی عێراقـی عوسمانی بڕیاری تەفروو توناکردنی قەڵاکـەی چەمچەماڵ و کوشـتن و دیـل کردنی هەمەوەنـدەکانیان دەر کردبوو ، ئـەوانیش ناوچـەکەیان چـۆڵ کـرد و پاشان لە بەمۆ دانیشتن .

دیسانەوە هەواڵی هاتنی هەمەوەندەکان بە ملك نیاز خان گەیشت . ئـەویش یەکسەر داوای لەکاتبی فەوج کرد ، تـا نامەیـەك بـۆ عـەلی مـوراد خـانی بـرای بنووسـێ کەلـە کەرەنـد بـوو ، تابـەخۆیی و سـەربازەکانیەوە بگەنـە شـوێنی مەبەسـت . عـەلی مـوراد خـانیش کـاتێ نامەکـەی پـێ گەیـشت بـەخۆیی و سەربازەکانیەوە بەرەو قەسری شیرین کەوتنـە ڕێ ، هەنـدێکیان لـە قەسـری شیرین و ئەوانی تریش لە سەرپێڵی زەهاو جێگیر بوون .

لــە ڕۆژانــی ســاڵی ١٢٨٧ی مــانگی کەدەکاتــە ســاڵی١٨٦٩.ز ، کاتێــك ناسرەددین شا بەمەبەستی زیارەت بۆ مەزارە پیرۆزەکانی کەربەلا و نەجەف

دەچـێت . جـوامێر ئەمـە بەهـەل دەزانـێ نامەیـەك بـۆ مـەلیك نیـاز خـان دەنووسـێ ، کـە داوای لـێ خـۆش بـوون و پەنابـەری لای شـا بـۆ بکـات . ناسرەددین شا کەلەزیارەت دەگەڕێتەوە ، ملك نیاز خان داواکەی جوامێری پێـشکەش دەکـات . ناسـرەددین شـا یەکـسەر لـەلای خۆیـەوە داواکـەی جـوامێری قبـوڵ کـرد ، بڕیـاری دا لـەنێوان کـەڵهوڕ و گـۆران جیگـای پـێ ببەخـشن ، ئـەوە بـوو لـە مـاهی دەشـت شـوێنیان بۆ دابین کـرد . وەك پـەنا بەرێك هەرچی پێویستییەك هەیە ساڵانە بۆی خەرج بکرێت .
ئـیتر هەمەوەنـد وەك بەشـێك لـە فـەوجی کەرەنـد حیـساب کـراو لـە ژێـر سەرپەرشتی ملك نیاز خاندا بوون . بەڵام ئەوەندەی نەبرد کەیەك هەفتەی بۆ هاوینی ساڵی ١٢٨٨ی مانگی مابوو ، دیسانەوە بەرەو شێخان و بەمۆ هەڵهاتن بە شەوخۆیان دەگەیاندە سەر سنورو دەست درێژییان دەکرد .

## کوشتنی ملك نیاز خان

ملك نیـاز خـان کـاتێ هـەواڵی یـاخی بوونی جوامێری پـێ گەیـشت زۆر لـەم کارە توڕەبوو ، چونکە کاتی خۆی دەخالەتی بۆ کردبوو تـا لای ناسـرەددین شاوە عەفو بکرێ و وەك پەنا بەرێك قبوڵ بکرێت . ئەوەبوو ملك نیاز خان کەوتـە کـۆ کردنـەوەی لەشـکر کـە بریتـی بـوو : لـە تیپـی سـەنجاوییەکان بـە سـەرۆکایەتی ئیـسماعیل خـان و ئەحمەدەوەنـد بێتـۆیی بەسـەرۆکایەتی شـا موراد خان و تایەفەی جەلالەوەند و تایەفـەی باڵاوەند بـە هاوکـاری کوڕانی خەسرەو خان لەکەرەند کۆبوونەوەیەکیان بەست .
پاش خۆ ڕێك خستنی ئەم تیپانە ، بەسواری و بە پیادە بەرەو لای ملك نیاز خـان بۆ پاتـاق ڕۆیشتن . ئـەو ڕۆژە ملك نیـاز خـان زۆر مانـدوو بـوو ، شـەو کەدەخەوێ ، ئیمام عەلی لەخەودا دەبینـێ و پـێ ی دەڵـێ : تـۆ خزمـەت کـاری ئیمام (حوسەین) ی ، ئەویش داوای تۆ دەکات کـەبڕۆی ، کـاتێ کەخەبـەری دەبێتەوە ئەم خەوە بۆ دەوروو پشتی دەگێڕێتەوە .

خوا حافیزی لە هاوڕێکانی دەکاو دەڵێ : ئەم جارە ناگەڕێمەوە! تاجی دەروێشی لەسەر دەناو خۆی فیدای ئیمام حوسەین دەکات . لەو کاتەدا هەواڵی هەمەوەندەکانی پێ گەیشت کەبەرەو دامێنی بەمۆ هاتوون ، سەنگەریان لێداوەو لە حاڵەتی ئامادە باشیدان . ئاڵای سوری نیشانەی جەنگیان لە سەر سەنگەرەکانیان هەڵکردووە ، ئەویش فەرمان بە لەشکر دەدات و بەرەو شێخان دەچن .

جوامێر لەلای خۆیەوە بڕیاری دابوو کەس تیر ئەندازی بەرەو لەشکرەکەی ملك نیاز خان نەکات .

لەناکاو یەکێك لەهەمەوەندەکان کەناوی مەحموود زاری دەبێ ، غافڵ گیرانە تەقە لەملك نیاز خان دەکاو دەیکوژێ . بە کوشتنی ملك نیاز خان سوارەی هەمەوەند شێخان و هۆرێن و زەهاو تاڵان دەکەن ، هەروەها چەند کاروانێکیش رووت دەکەنەوە . نایب خانەبێگ کەنایبی فەوجەکەی ملك نیاز خان بوو ئەویشیان سەربڕی و گەلێك سەربازییشیان کوشت . لەدەست نووسەکەدا هاتووە : ملك نیاز خان بەهەموو عەشایەری ناوچەکەوە هێرش بۆسەر جوامێر دێنێ ، لەم شەڕەدا مەحموود زاری کەلەتیرەی سەفەرەوەند بوو ، لەگەڵ عەزیز حەیدەر کەلەتیرەی ڕەمەوەند بوو هەڵ دەکوتنە سەر ملك نیاز خان و دەیکوژن ، ئەسپەکەشی دەکەوێتە دەست عەزیز حەیدەر و دەمانچەکەیی و چەند کەرەستەیەکی تری جەنگی دەست مەحموود زاری دەکەوێت .

دەروێش قولی کەرەندی لە جوامێر نامەدا بەچەند بەیت شیعر باسی کوژرانی ملك نیازخان دەکات، کەبەشێوەی زاراوەی کەڵهوڕ هۆنیوێتەوە، لە لایەن مامۆستا محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ) وەرگێڕاوەتەوە سەر شێوەی سۆرانی ، لە ساڵی ۲۰۰٦.ز بەرامبەر ۱۳۸۵ ی هەتاوی لەشاری بۆکان .

لـە شاخـەی شەیپور جوامێر پاشـــا
وەك شـێر بۆ ئاسك بەگیـان خرۆشـا
هەمــــوو لەسەنگەر لـە پێـــوارەوە
لـــــە جێگـەی پەنهان نـادیـــارەوە
کاکـــە بـەوێنەی ئەژدیهای ئـــەژدەر
لە بورجی سـەنگەر سـەری کێشا دەر
بــەڵام پێی گوتن نەسحەت بێ لاتــان
تیر مـــــەکەن بەڕوی ملك نیازخـــان
چاکـــەی بۆم بووە و لـەبەرچاومـــە
لـــــەداخی دەوڵـــــەت گـــــلاراومـە
یاران کەبیستیان روخسەت لە پاشـا
بڵاو بوون یـــەکسەر هەریەك لـەیەك لا
سلسلـەی قوشون سەرتیپی سـەروەر
هـــاتن سەنگەریان گرتن بەرامـــبەر
ســـــەرتیپ فەرمانی ئاگری دانــــێ
بـوو بـــەتـــەقەیەك گەر خوا بزانــــێ
چـــریکێ ئازا دڵ وەبێ ئــەندێـــش
دای لەئەسپەکەی سەرتیپی سەرکێش
تەقە وای کردبـوو بوو بووە مەرگـــەڕاو
نـــەدۆست نـەدوژمن نابینرا بە چـــاو
لەولاوە مەحـموود پای نایە ئەوبــــەر
تفەنگی شامار نیشتە پای ســەنگــەر
ئـــــەژنۆی وانوســـا بەزەمینـــــەوە
تەپکی شـەش خوانی نا بەسینـــەوە

## بەڵگەنامەی سەردەمی قاجاریەکان

لە (١٩٨٠/١/٢١.ن) (٣٠ سەفەری ١٢٩٨ ) کۆچی (١٢٦٠/١١/٢) ی هەتاوی سولّتان ڕاز گرەکەی خۆی لەگەڵ کاربەدەستی تەلەگرافی تایبەتیدا ناردووە ، هەواڵیان ناردووە کەناو براو گەیشتۆتە (وان)، بروسکەی لێکۆڵینەوەکانی بەم زووانە گەیشتووە . بڕیاری سەر سنورو ئەرخایەن بوونی هومایۆن دەدەین ، بەردەوام بوونی ئاژاوە دژی بەرژەوەندی هەردوو لایەو دەبێت بەزوویی لەناو ببرێ ، هەواڵ گەیشتووە کە خێڵی ئەحمەدەوەند (هەمەوەند) نیازی دەست درێژییان هەیە . تکا دەکەم کەزۆر بەتایبەتی ڕێیان لێ بگرێت . گەورە باڵیۆزی ئنگلستان لەگەڵ شارژدافردا – دا بۆ لەندەن چوونە ، هێشتا بەرنامەی کار نەگەیشتووە ، ئاخۆ گەورە باڵوێزی فەڕەنسا ڕازی دەبێ ! ڕوون کردنەوەی دانووسانەکانی بەندە لەگەڵ سولّتاندا کاریگەرەو دارو بارەکە چاکترە ، هیوا دارم لەم ڕۆژانەدا مزگێنی ئەنجام دانی کارەکەتان پێ بگەیەنم . لەلاپەڕە (٢٩٠) دا هاتووە لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا کە (١٩٨٠/١٢/٩.ن) (٦ محرەم ١٢٩٨ ) کۆچی برووسکەیان کردووە ، ئەگەر ئاژاوە چیەکان بەخاکی عوسمانی و بەغدا تێپەڕن ، ئەوا سزا دەدرێن ، تاڵانیەکان بگێڕنەوە چاودێری یاساو نەزم بکەن ، بەڵام کە دەڵێن ئەم جێگایانە خاکی عوسمانی نین، ئەوەش ڕاست نییە کەئاژاوە چیەکان عوسمانین ، شکات لەوە دەکەن کە بڕیار بوو ئەحمەدەوەند (هەمەوەند) تەمێ بکرێ . کەچی ئەنجام نەدرا ، دەست نیشان کردنی جێگای ئاژاوەچیەکان پێویستە ، وەڵامی برووسکەکان بدەنەوە .

**بەڵگەنامەی ژمارە (١٠٩)**

**بابەت : ناکۆکی سەر سنور .**

**مێژوو : (١٨٨١/٩/٢٦.ن) (٢ زیقە عدەی ١٢٩٨ )ی کۆچی (١٢٦٠/٧/٤)ی هەتاوی .**

## نامەی میرزا سەعید خان

## بۆ

## موحسین خان باڵیۆزی دەوڵەتی ئێران لای عوسمانی

**ئەمە بەشێکی ئەو بەڵگەنامەیە کە زیاتر پەیوەندی بە هەمەوەندەوە هەیە . بەڕێز ! گەورە پیاوانی دەوڵەتی ئێران ، لە (١٥) ساڵ لەمەو بەرەوە تا ئێستا چەندان جار دەریان بڕیووە ، کەهەڵسو کەوتی پیاو گەلی سەر سنوری عوسمانی ، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ مەرجی دۆستایەتی دوو دوڵەتدا یەك ناگرێتەوەو زیاتریش بە پێچەوانەی خواست و ویستی ئەم دوو دەوڵەتەیە ، ئەگەر ئێران لە جیاتی لێبووردن و چاو پۆشی لەو کارانە ، بیویستایە وەك ئەوان ڕفتار بکات، ئەوا ئاکامەکەی لە ئاڵۆز بوونی ئاسایشی سنورو تێکچوونی هێوری خێڵەکانی هەردوو لا هیچی تری لێ نەدەهاتە بەر . چونکە بەدەستەوە دانی هەڵهاتووەکان و دەست نەگرتن بەسەر عەشایەری یەکتردا ، بەشێك لەمەرجەکانی بڕیار نامەکانی دوای هەموو ئاشت بوونەوەیەك ، جەختی لەسەر کراوە ، دەووڵەتی ئێران لەهەموو کاتێکدا ئەم مەرجانەی بەجێ هێناوە .**

**بەم شێوەیە (عەزیز بەگی بابان) و خێڵەکەی و هەندێ ئاژاوە گێرانی ناوچەی هەکاری و هەر تووش و ئەحمەدەوەند چەلەبی و (هەمەوەند) و محمد ئال عەلی خان و کێ و کێ ... کەلەڕاستیدا هەموویان لە عەشیرەتەکانی ئێرانن و مایەی کێشەن ، بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئێرانی بوونیان ، تەنیا لەبەر بەجێ هێنانی مەرجەکانی بڕیار نامەکان ، وەك گێڕانەوەی ئاسایشی سنورەکان . دراونەتەوە بە عوسمانی بۆ سزا دانیان .**

له بەڵگەنامەکەدا هاتووە کە ئەحمەدەوەند چەلەبی (هەمەوەند) مان ناچار کرد هەڵبێت و لەم ڕێیەدا تەنانەت سەرتیپێك و سنور دارێکی بڕوا پێکراوی وەك (ملك نیاز خان ) مان لێکوژرا ، کەچی هەر گەیشتنە خاکی عوسمانی و کەوتنە بەر دەستی ئەو دەوڵەتە ، هەرگیز نەیدایەوە بە ئێران و هەوڵی ئەوەی نەدا ، کەحەزی ئێمە بەجێ بهێنێ ، وا ئێستاکەش لە تاڵان کردن و کوشتنی کاروان چی و ڕێبوارانی ئێران دەست ناپارێزن و هێزەکانی ئێران تا ئەم دواییانەش پارەیەکی زۆری سەرف کردووە ، لەهەوڵی ئەوەدا بووە کە بیان شکێنن و هێشتا لێمان ڕوون نییە بەتەواوی شکابن و یان نا[٤٤]!

## کوشتنی حەمە پاشای جاف

ئەم بابەتە نووسینی دکتۆر حەسەن جاف ، کەلە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بەناو نیشانی باورد تر لە ڕوداوە مێژوویەکان بکۆڵینەوە .

شەڕی جاف و هەمەوەند پاش کوشتنی حەمە پاشا[٤٥] لەئەنجامی ئەم شەڕەدا جاف بە سەر هەمەوەندا زاڵ بووە ، بەپێی یاداشت و زانیاری یەك بەدەست هاتووە ، هۆزی بەناو بانگی هەمەوەند چەند شەڕێکیان لەگەڵ تیرەکانی جافدا کردووە ، بەتایبەتی لەگەڵ تیرەی مکایلێدا ، کەتیرەیەکی ناسراوی جافن و لە گەڵیاندا دراوسێ بوون و هەمیشە لەسەر جێ و هەوار و دەغڵ و دان و ناکۆکی عەشایەری بەشەڕ هاتوون، ئەم تیرەیان بەسەختی شکاندووە و، هەروەها زۆر لەڕێگرەکانی هەمەوەند دەست درێژییان لەناوچەکانی جاف دەکردوو ئەزیەت و ئازاری خێڵە سەقامگرتووەکانی جافیان دەدا، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ، دوو شەڕی گەورە لە نێوان هەمەوەند

---

[٤٤] محمد حەمە باقی ، کتێبی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵای نەهری ، لەبەڵگەنامەی قاجاریدا . هەولێر ، چاپی یەکەم ، ساڵی ٢٠٠٠.ز ، لاپەڕە ٣٥٩-٣٦٠ .

[٤٥] دکتۆر حەسەن جاف ، باووردتر لەڕوداوە مێژووییەکان بکۆڵینەوە ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، بەغدا ، کانونی یەکەم ساڵی ١٩٨٧. ز ، ژمارە ١١٦ .

و جافـدا ڕووی داوه، دوای پـەنان دانـی کـەرەم وەیـسی یـەکان لەلایـەن هەمەوەنـدەوە لـەم دووشـەڕەدا جافـەکان بەسـەر هەمەوەنـدا زاڵ بـوون ، ئـەم دوو شـەڕە یـەکێکیان لەناوچـەی باسـەڕەو ئـەوی تریـان لەناوچـەی زەهـاودا ڕوویـداوە ، دوای ئـەم شـەڕەی دواییـە جـوامێر دەسـتی لـە یارمـەتی کـەرەم وەیسی یەکان هەڵگرت .

تایەفەی کەرەم وەیسی تـەفرو تونـا بـوون و جـوامێری هەمەوەنـدیش داوای پەنا هەندەیی لە (ناسرەددین شا) ی قاجار کردوو بە پەناهەندە قبـوڵ کـراو هەموو ناوچەی زەهاوی پێ بەخشرا .

بۆ ڕوون کردنەوەی باسی چۆن ڕوودانـی ئـەم شـەڕە باشتر وایـە باسـەکە بـە زمـانی بێلایەنێکـەوە بگێڕینـەوە ، ئـەو بێلایەنـەیش حـاجی تـۆفیقی پیرەمێـردی خوالێخـۆش بـووە کـە هاوچـەرخی مـەحموود پاشـاو ئـەو ڕووداوانە بووە .

پیرەمێـرد لـەم بـارەوە دەڵـێ : کوشـتنی حەمـە پاشـا ئینقلابێکـی گـەورەی خستە ناوەوە قاتیلەکان ڕوویان کردە هەر دەرماڵێ دەریـان کـردن ، نهایـەت لـە وەقتێکـدا جـوامێر ڕەئیـسی هەمەوەنـد لـەماڵ نـابێ ، خۆیـان دەکووتنـە ماڵی جوامێر و قبووڵیان دەکەن ، زاتەن جوامێر ڕەئیسێکی زۆر باڵا پـەرواز وخولیـا پـەروەر بـوو ، بـەو سـەد سـوارەی هەمەوەنـد پەنجـەی لەگـەڵ ڕۆم و عەجەم لێ دەداو دەی گووت : سـەرەکە ڕۆم و عەجـەمت بەتەمایـەو هیـچیان دەستیان نات گاتێ . سەجعەی مۆرەکەی ئەمە بوو:

بحمد الله جوانمرد جهانـم

همیشه تیغ فرق دشمـنانـم

بابێینـەوە سـەر ڕەوتـی خۆمـان ،هەرچـەندە حکومـەت و مـەحموود پاشـا کردیانـە سـەر جـوامێر ، فائیـدەی نـەبوو ... دوایـی مـەحموود پاشـا خـۆی سـوار بـوو ، لەشـکری جـافی شـوێن کـەوت . زۆربـەی هەمەوەنـد ئاڵابوونـە باسەڕە سەنگەریان کردبوو ، ماڵ و منداڵیان بۆ ئێران ناردبوو ، شـەڕێکی

گـەورەیان کـرد ، لەشـکر شـکێن لـەم شـەڕە دا دەروێـشی بـرای جـوامێر کـوژرا[٤٦]ئـەو ڕۆژە بـەگ زادە شـەڕی کـوردە ناموسـیان کـرد یـەك لـە یـەك ئـازاترو بەهەڵمـەت تـر بـوون، هەمەوەنـد ناچار شـکان ، لەسـیروان کردیانـە ئەو بەرەوە .

مامۆسـتا ئـەمین زەکـی دەڵـێ : چـونکە جـوامێر ڕازی نـەبوو کەشـاتری بـدا بەدەسـتەوە ، لـە نزیـك (گـل) . جـاف و هەمەوەنـد بـەرەنگاری یـەك بـوون و جـاف شـکا . تـەقی پاشـای والی بەغـداد ، قـووەتێکی عەسـکەرییەی بـۆ یارمـەتی جاف نـارد . شـاتری جـاف ، لەگـەڵ ئـافرەت و منـداڵی هەمەوەنـد ئیحتیاتـەن بـۆ زەهـاو نێـردراو بەشـی شـەڕکەری هەمەوەنـد بـۆ مـاوەی دوومـانگ زیـاتر مەفرەزەکـەیان غافڵاندلـەم بەینـەدا (ظـل الـسلطان) والی عمـومی ئەسـفەهان ئۆردویـەکی حـازر کـرد و نـاردی بـۆ معاوەنـەتی جوامێر ، لەسەر ئەمە جوامێر بە خۆی و چل سوارەوە چووە ئەسفەهان[٤٧] .

جوامێر ڕووی کردە تاران و خۆی گەیاندە ناسرەددین شاو بە عیبارەتێکی ئیقناع کاری دەڵێ : قیبلەی عالەم ، محمد پاشای جاف کەهەموو زەهاو و سەرپێڵت دابوو پێی ، قەدری نیعمەتی نەزانی ، ڕۆییـەوە ، تاڵـانی کـردوو کـوژرا قاتیلـەکانی خۆیـان خـستە مـاڵی بەندەیـەکی حـەقیرت . ئـیتر ئـەو بەندەیە حەیات و عەشیرەتی لەسەر دانا، ئەویش خۆی خستۆتە دەرباری شـاهی ، ئینجـا دەربـاری شـاهی لـەکوێ و ڕەشمـاڵی کوردێـك لـە کـوێ !؟ غیرەتـی شـاهی هینایـە جۆش و ئـەو شـوێنەی بە جاف درا بوو، دایـان بـە جـوامێری هەمەوەنـد ، هەمەونـد دوای ئـەم خەتایـە خۆیـان نەگرتـەوە . حەمەپاشای جاف لەساڵی (١٢٩١) ی کۆچی لـەتاو عوسمانییـەکان بـەرەو ئێـران هـەڵهات . لەلایـەن ناسـرەددین شـاوە ناوچـەی زەهـاو و شـیخان و

[٤٦] دەروێش برای جوامێر لەناوچەی باسەڕە نەکوژراوە وەك دکتۆر حسن جاف باسی دەکات . بەڵکو لەسنور ئێران کوژراوە . هەر لەوێش نێژراوە .

[٤٧] محمد ئەمین زەکی بەگ تاریخی سلێمانی و وڵاتی ، چاپخانەی نەجاح ، بەغدا ، ساڵی ١٩٣٩.ز

جوانڕۆی پێ بەخشرا، لەبەر ئەوەی جافەکان خەریکی مەڕو ماڵت بەخێو کردن بوون ، گەرمیان و کوێستانیان دەکرد ، بەهۆی ئەمەوە زیانێکی زۆر لەناوچەکە دەدەن ، ئەمەش بووە هۆی وەڕەس بوونی خەڵکی ئەو ناوچانە حکومەتی ئێران چەند جارێك دەکاتە سەر حەمە پاشا کەجاف لە گوندەکان جێگیر بکات ، بەڵام ئەم کارەی بۆ مەیسەر نابێت . لەمەوە نێوان ئێران و حەمەپاشا تێك دەچێت . حەمەپاشا بەهۆی ئەم تێك چوونەوە نامەیەك بۆ مەحموود بەگی کوڕی دەنووسێ کەلەتاران دەبێ ، داوای لێ دەکات کە بەزوویی بەرەو سنور بێتەوە ، بەگەیشتنی نامەکە مەحموود بەگ تاران بەجێ دێڵێ ، لەگەڵ ئەو پەنجا سوارەی لەگەڵیدا بوون ، کەوتنە بڕینی هێڵی تەلەگرافی نێوان تاران و هەمەدان ، حەمەپاشاش زەهاو و جوانڕۆی تاڵان کردوو بەرەو شارەزوور هاتەوە[٤٨].

وەك پیرەمێرد دەڵێ :

جاف بۆ زیان ، هەمەوەند بۆ شەڕ

شێخ بۆ تەفرەقە ، زەنگەنە بۆ گەڕ

کاتێك حەمەپاشا گەڕایەوە لەلایەن عوسمانییەکانەوە دەکرێتە قائیم قامی هەڵەبجە ، ئەوەی شایەنی باسە لەو ماوەیەدا کە حەمە پاشا لەئێران بوو ، بەپێی سیاسەتی پاراستنی هاوسەنگێتی هێز ، بۆ ئەوەی هێزێکیان لە جافەکان بەدەستەوە بێ ، دەسەڵاتی زۆر دەدەن بە عەزیز شاوەیس ، سەرۆکی تایەفەی کەریم وەیس ، کەلەگەڵ حەمە پاشا دا نەرۆیشتوون بۆ ئێران ، دەوڵەتی عوسمانی موڵکێکی زۆری بەم تایەفەیە بەخشیبوو . پاش دانانی حەمەپاشا بە قایم قامی هەڵەبجە ، کەرەم وەیسی یەکانیان هان دەدا دژی حەمەپاشا بجوڵێنەوە، تایەفەی کەریم وەیسی تایەفەیەکی دڕو ئازا بوون ، سەرۆکەکەیان عەزیز شاوەیس پیاوێکی

---

[٤٨] محەمەد عەلی سوڵتانی ، ٢/١ ایلات و طوایف کرماشاهان ، تاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز ، لاپەڕە ١٧٧-١٧٨ .

دەسەڵات دار و خاوەن کەس و عەشرەت بوو ، هاندانی گەیشتۆتە ڕادەیەك عەزیز شاوەیس ڕێگای پیاوەکانی حەمە پاشایان نەداوە کە کاروو باری ڕەسمی قایم قامێتی هەڵەبجە بەڕێوە بەرێت . عەزیز شاوەیس ماڵی لە بەشارەت بووە کە (٧ – ٨) کم لە هەڵەبجەوە دوورە ، حەمەپاشا دەنێرێ بەشوێن عەزیز شاوەیسدا ، ناڕوا بۆ لای ، حەمەپاشا ناچار دەبێ ، دەنێرێ لە هەلێکدا دەیگرن ، دەیخەنە بەندیخانەی هەڵەبجەوە، عەزیز ماوەیەکی زۆر لەبەندیخانەدا دەمینێتەوە تا سەرئەنجام بە نەخۆشی سیل بە مردنی خوایی دەمرێ ، کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی ، هەروەها هەنێ لە دوژمنانی حەمەپاشاو دەسەڵاتی هۆزی جاف پڕو پاگەندە زۆر بڵاو دەکەنەوە ، بۆ ئیسپات کردنی ئەم تۆمەتە بەسەرحەمە پاشادا دەکەونە تەلاشەوەو لەم هەوڵ دانەیاندا سەر دەکەون و تیرەی کەرەم وەیسی دەچێتە دڵیانەوە ، کەسەرۆکی تیرەکەیان دەرمان خوارد کراوە ، ئیتر ئەمە دەگرنە دڵ و بەشوێن هەلێکدادەگەڕێن حەمە پاشا لەناو بەرن ، ئەوە بوو کاتێ حەمە پاشا لە ساڵی (١٢٩٩) ی کۆچی لەناوچەی چیمەنی نزیك کفری خەریکی ڕاو کردن دەبێ دەیکوژن[٤٩]. لەدەست نووسەکەی حەیدەرعەزیز خەسرەو ئاغا دا هاتووە ، کاتێك بکوژانی حەمەپاشا ڕوو دەکەنە ماڵی جوامێر ، فەقێ قادریش نامەیەك بۆ جوامێر دەنووسێ و زۆر بە ئیلحاحەوە داوای لێدەکات ، کەئەوانە نەگرێتە خۆی ، چونکە دەبێتە هۆی فەوتاندنی ، جوامێریش دەڵێ : بە پشت و پەنای خوای گەورە منیش پەنایان دەدەم با ئەمە لەئەستۆی من بێت . ئەگەر ناجیح بووم سەربەرزییە بۆ هەمەوەند ، ئەگەر ناجیحیش نەبووم با جوامێر لە هەمەوەند کەم بێتەوە. جوامێر تەدارەکی یاخی گەری ئەبینێ ، مەحموود پاشا جەسارەت

[٤٩] حەمە پاشا کوڕی کەیخەسرەو سلێمان بەگی زاهیر بەگە، لە ساڵی ١٢٣٠ ی کۆچی هاتۆتە دنیاوە و لەساڵی (١٢٩٩) ی کۆچی کوژراوە . لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا لەسەر داخوازی سەرۆکی تیرەکانی کرا بە سەرۆکی هۆز .

ناکا بۆ سەر جوامێر بێ ، ئەکەوێتە شکات کردن و تەلەگراف لێدان بۆ کاربەدەستانی عوسمانی .
موشیر هیدایەت پاشا نامەیەك بۆ جوامێر دەنووسێ و دەڵێ : ئەم شەخسانە تەسلیم بە حکومەت بکە . فەقێ قادریش دیسانەوە بە ئیلحاحەوە بۆ جوامێر دەنووسێ و دەڵێ : بۆ ماوەیەك دووریان بخەرەوە هەتاکو صوڵحیان بۆ دەکەین، بەڵام فایدەی نابێ ، جوامێر ئەڵێ من یاخی دەبم ! با حکومەت دەست لە ئێوە هەڵگرێ . جوامێر خۆی و جەماعەتێك لە گل و دەلۆ و گێژ و سۆفیۆەند و مامڵێسی و باشۆکی[٥٠]، خۆی و براکانی خێڵی حەمەڕەش و بەرەی کەرەم وەیسی ، دەچنە خوارێ بۆ دەوری بنگوڕ.
هیدات پاشا بە دوو تابوور عەسکەر لەگەڵ جاف و چی ئیمکانیاتیان لەگەڵیان بووە ئەکەونە دوای جوامێر خان ، لەکەلی ئەشکان بەرەنگاری یەك دەبن ، لەم شەڕەدا ماینەکەی دەروێش دەکوژرێ ، قادر حەمە ڕەش لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ ، بەڵام لە شکر پێیان دەگات و هەردووکیان دەکوژرێن ، لەم شەڕەدا چەن جافێکیش کوژرا ، جوامێر و لەشکرەکەی لە چیای داڵەهۆ خۆیان دەگرنەوە . کاتێك جوامێر گەیشتە چیای داڵەهۆ عەسکەرەکان نەیان توانی بەدوایان بچن ، جافەکانیش ووتیان ئێمە حەمەپاشامان کوژراوە، هەمەوەندیش دەروێش برای جوامێریان کوژراوە ناچار دەگەڕێنەوە ، هەمەوەندەکانیش دەکەونە تاقیبی دەروێش و قادر حەمەڕەش ، کەدەزانن کوژراون ، ئیسماعیل خان برای جوامێر و ئەحمەد عەزیز خەسرەو لەگەڵ عەلی ڕەش ئامۆزایی و چەند کەسێك بە دوای جەنازەکەی دەروێش و قادر دا دەگەڕێن، لەم کاتەدا هەندێك سوارەی تریان پێ دەگات وەك کەریم حەمەڕەش لەگەڵ چەند سۆفییەوەندێك، پاشان جەنازەکان هەڵدەگرن و دەیان بەن لەخانەشۆر دەیان نێژن[٥١] .

---

[٥٠] باشۆکی خێڵێکی کوردە لەناوچەی (ڕەوان سەر) ی سەر بە شاری سنە دادەنیشن . جەردەی با شۆکی بەناوبانگە ئەگەر کەسێك جەردەیی بکات دەڵێن جەردەی باشۆکییە .
[٥١] دەست نووسەکەی حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا .

## چەند ڕاستییەك دەربارەی شەڕی جوامێر و مەحموود پاشای جاف

لێرەوە دەمانەوێ ڕوونتر بچینە ناو باسەکە ، ئەوەش بەپێی ئەو نووسین و زانیارییانەی کە زۆربەی نووسەران لەم بارەوە نووسیانە ، ئەوەتا حەسەن فەهمی بەگی جاف لە کتێبی مێژووی هۆزی جاف و مەحموود پاشای جافدا دەڵێ : کاتێ عەشرەتەکەی عەزیز شاوەیس هەواڵی مردنی دەبیستن (٦٠ – ٧٠) سوارێك دێن بۆ بردنی تەرمەکەی ، بەڵام نایەنە ناو شارەوە ، بەڵکو دوو سێ کیلۆمەترێك لە دووری هەڵەبجەوە دا ئەبەزن و چوار پێنج ژن و مەلایەك ئەنێرن بۆ ناو شار بۆ هێنانەوەی لاشەکەی ، بەم جۆرە تەرمەکە وەر ئەگرن و ئەیبەنەوە .

هەروەها کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف دەڵێ : قیسمێ لەو جافانە کە خیانەتیان کردبوو لەلایەن حەمە پاشاوە دەگیرێن ، دوو سێ یەکیان لە حەپسی خۆیدا مردن ، ئەوانیش لەم مەسەلە موتەئەسیر بوون بە فیتنە بەعزێ ئەشخاسی تریش تەحریکاتی لەناودا کردن[٥٢] .

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە عەزیز شاوەیس هەرتەنها خۆی لە حەپس خانە نەمردبوو ، بەڵکو چەند کەسێکی تری لەگەڵدا بووە ، وەك لە ڕیش سپییەکانی هەمەوەندم بیستوە کە حەمەپاشای جاف ، بەنیاز نەبووە کە جەنازەکانیش بداتەوە ، بۆیە بەرەی کەرەم وەیسی یەکان ناچار دەبن کە کۆمەڵێك ژن بۆلای حەمەپاشا بنێرن ، ئەوانیش سەری خۆیان لە قوڕ دەگرن و بەشیوەن و یەخەدادڕین بۆ لای حەمەپاشا دەچن ، بەم جۆرە توانیان جەنازەکان وەربگرن ، ڕەنگە هەر ئەمەش وای کردبێ ، کە بەرەی کەرەم وەیسی دەست لە حەمەپاشا بوەشێنن و بیکوژن .

حەسەن فەهمی جاف دەڵێ : پاش کوژرانی حەمەپاشای جاف ، مەحموود بەگی کوڕی ئەچێت بۆ کەرکوك ، پەیوەندی لەگەڵ والی موسڵدا پەیدا دەکاو

---

[٥٢] کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف ، تەئریخی جاف ، ساڵی ١٩٩٥.ز ، لاپەڕە ١٨٠ .

هەواڵی کوژرانی باوکی ئەداتێ و تێی ئەگەیەنێ کەئەم پیاوە قایم قامێکی حکومەت بووە کوژراوە ، ئیتر حکومەت دەست بەجێ مەحموودپاشا دەکا بە سەرۆکی جاف و قایم قامی هەڵەبجە ، تابوورێ عەسکەری سوارەش ئەنێرێ کەلەژێر فەرمانیان بن و لەگەڵ لەشکری جافدا بەدوای دوژمنەکانیان بگەڕێن[٥٣] .

محەمەد سەعید سەلیم جاف لەم بارەیەوە دەڵێ : لەپاش سوگەواری مەحموودپاشای کوڕی حەمەپاشا لەشکری جافی ئامادەکرد و (٥٠٠) ئێستر سواری سەربازیشی لە حکومەتی عوسمانی وەرگرت[٥٤] . هەروەها کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف دەڵێ: مەحموود پاشا بە (١٢٠٠) سوارەوە ئەچێتە کەرکوك ، موخابەرە لەگەڵ ئەستەمبوڵدا ئەکا ، ئەمری ڕیاسەت و قایم قامی بۆ مەحموود پاشا ئەدەن و (١٠٠٠) نەفەر عەسکەر بۆ ناو جاف ڕەوانە دەکەن ، لەلاپەڕە (١٨٣) ی کتێبەکەیدا دەڵێ مەحموودپاشا (٣٥٠٠) سواری لەگەڵدابوو[٥٥]. لەوانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ ، کە لەشکری جوامێر بەرامبەر جاف زۆر نابەرامبەر بووە، چونکە جوامێر نزیکەی سەد سواری لەگەڵدا بوو ، کەچی بەم لەشکرەکەمەوە توانی شاترییەکان لە هێرشی خێڵی جاف و لەشکری عوسمانی ڕزگار بکات . هەرچەندە ئەمەش بە کوژرانی دەروێشی برای و قادر حەمەڕەش ئەنجامدرا دواتر کۆتایی بە کێشەی نێوان خێڵی جاف و هەمەوەند بەوە هات کە فەقێ قادر کچێکی خۆی داوە بە کوڕی حەمە پاشای جاف[٥٦] .

---

[٥٣] حەسەن فەهمی بەگی جاف ، مێژووی هۆزی جاف و مەحموود پاشای جاف . ئومێد ئاشنا پێشەکی بۆ نووسی وەو چاپی کردووە ، لاپەڕە٤١ .

[٥٤] محەمەد سەعید سەلیم جاف ، جوکل هەمەوەند کێیە ؟ ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ٧١ بەغدا ، ساڵی ١٩٧٨.ز ، لاپەڕە ٧٩

[٥٥] کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف ، تەئریخی جاف ، ساڵی ١٩٩٥.ز ، لاپەڕە ١٨٣ .

[٥٦] محەمەد سەعید سەلیم جاف ، جوکل هەمەوەند کێیە ؟ ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ٧١ بەغدا ، ساڵی ١٩٧٨.ز ، لاپەڕە ٧٩ .

## فه تحنامەی حسام الملك

میرزا ئەحمەدی ئیلهامی کرماشانی (١٢٤٦-١٣٢٥) کۆچی مانگی ئەگەر چی تاکو مابوو بەهۆی حسەین خان حسام الملك حوکمڕانی کرماشان بەئاواتی بەچاپ دانی بەرهەمەکانی نەگەیشت ، کەبریتی بوون لە شەرحی مەنزومە ، باغی فیردەوس ، فەتحنامەی حسام الملك و مەسنەوی حوسنی منظر ، دیوانی قەسیدەکان و غەزەلەکان و حسەینیەو، بەڵام لە ساڵانی دوای مردنی جگە لەبەرهەمە هاوچەرخەکانی دوو بەرهەمی هەمیشە زیندوشی بە ئاوی زێڕ نووسرایەوە . یەکەم باغی فیردەوسە کە بەیارمەتی خوا لێخۆش بوو حاجی حوسێنی موشیری و بەهاوکاری دکتۆر عەبدول حوسێنی ئیلهامی ساڵی ١٣٢٧ ی هەتاوی لە قطعە ی ڕەحلی و لە (٢٤٤) لاپەڕەدا لە چاپەمەنی کاوە لە کرماشان بە چاودێری خوا لێخۆشبووان فەرەجوڵای کاویانی و باقری شاکری لە چاپ درا . پاشان ئومێدی ئیسلام پەنا گولْ بژێریکی لە بەرهەمی ئیلهامی کە شەقامی یەکەم و بەشێك لە شەقامی دووەم تا سەرەتای بابەتەکە ، کەلە وەسفی شەڕەکانی حەزرەتی ئەبو الفزل عباس لەگەڵ مارد بن صدیق تغلوبی ، بەپێی گێڕانەوەی هەندێك لەزاناکان و هەڵبژاردەی غەزەلەکان و قەسیدە مەسنەوی یەکان بە پێشەکی و پەراوێزەوە کۆکردۆتەوە و لە چاپەمەنی میراتی مەکتوبدا لە چاپی داوە. ئەم فەتحنامەیەش لە بەرهەمە بەنرخەکانی ئیلهامی یە کە تا ئێستا لە چاپ نەدراوە ، چونکە هاوکاتە لەگەڵ ڕاپۆرتی ڕۆژانەی حسام الملك لە ڕوداوی سەرکوت کردنی هەمەوەندا ، بەبەیت ووتراوەتەوە و هەروەها توانایی شاعیر لە ڕاستی نووسینی ئەم بەیتانەدا ئاشکرایە ، جگە لەوانەش شایەنی باسە کەئەم فەتحنامەیە یەکێکە لەسەرچاوە بەنرخەکانی مێژوویی کرماشان ، کە ڕوداوی ناوچەکە تاکو بەر لە بزوتنەوەی مەشروتیەت بە ووردی باس دەکات .

ئەم چاپە لەسەر ئەساسی ئەم دەقەی کە هەیە و لە مەجلیسی شورای ئیسلامیدا توێژینەوەی لە سەر کراوە بە سوپاس لە مامۆستای پلە بەرز بەڕێز حائیری کە هەمیشە لەگەڵ توێژەرانی بواری کولتوری ئێران هەوڵی داوە و خۆی ماندوو کردووە .

خاڵی جێگای سەرنج لەم فەتحنامەیە ئەوەیە کە لەهەموو سەرچاوەکاندا کاتی ڕودانی سەرکوت کردنی جوامێریان ١٣٠٤ی کۆچی مانگی داناوە، لە کاتێکا کە شاعیر بەرواری تەواو بوونی بەیتەکەی ١٣٠١ی کۆچی هێناوە .

بەو هیوایە ئەم هەوڵدانە ببێتە تەواو کەری مێژووی کرماشان هەموو خۆشەویستانی مێژوو ناس کەڵکی لێ وەربگرن .

محمد علی سوڵتانی

تاران – ١٣٨٤هەتاوی

ئەم بەسەرهاتە بە شێوەی بەیت دانراوەو بەزمانی فارسی کەمن لە سەر داواکاری بەڕێز کاك دارا ئەحمەد بەگی هەمەوەند هێناومەتە سەر زمانی کوردی ، هەرچەند بێ کەم و کوڕی نییە بەڵام هەوڵی خۆمم لەگەڵ داوە .

و: ئەمیر کەریم نژاد

محەمەد سەعید نەجاڕی (ئاسۆ) دەربارەی فەتحنامەی حسام الملك دەڵێ :

یەکجار مەسنەوییەکی بەهێزەو لەبارەی کلاسی شیعرەوە شان لەشانی شانامەی فیردەوسی دەدات . هەر بەوەزنی شانامەشە (فعولن فعولن فعولن فعل) ، بەڵام زۆر خۆش خزمەتی و چاپلوسی و پاچەخاری بۆ قاجارییەکان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا جوامێر خان و کوردەکان بەناحەز و تاڵان چی باس دەکات . لەبارەی جوامێر نامەشەوە دەڵێ : کاتێ کەجوامێرنامەم خوێندەوە یەکسەر عاشقی شەخسیەت جوامێر و دڵسۆزی و شیعری دەروێش قولی کەرەندی بووم، کەچۆن ئەم پیاوە ڕەشیدەی ناساندووە، تەنانەت کاری واشی نەکردووە دڵی ملك نیاز خان و شای

قاجار و دەست و دایەرەی دەوڵەتیشی لێ بڕەنجێ . بگرە بەو پەڕی میانە ڕەوییەوە هەردوو لای وەسف کردووە، خەمی ملك نیاز خان دەخوا لەکوشتنیداو ئازایەتی جوامێریش دەگەیێنێت . ئێمەش لێرەدا دەبێ ئەوە دەست نیشان بکەین، ئەوانەی کە کوردستانیان داگیرکردووە، هیچ کات بەباشی باسی کوردیان نەکردووە . ئەوەی بۆخۆیان حەڵاڵ بووە بۆ کوردیان بەحەرام زانیوە، هەر ئەوەندە کوردیان ویستووە کەپێکیان سپاردووە یان بەیەکیان بەکوشت داون . هەموو شۆڕشو چەکدارێکی کوردیان بە چەتەو تاڵان چی لە قەڵەم داوە، کەچی خۆیان بەقیبلەی عالەم و جێ نشینی خەلیفەکانی ئیسلام و سێبەری خوا ناودەبرد .

ڕاستە فەتحنامەی حسام الملك زۆر تانەو تەشەنەی بەرامبەر هەمەوەند و جوامێر تێدایە، بەڵام هێشتا داستانێکی مێژوویی پڕ بایەخی بۆ تۆمار کردووین، کەڕۆڵی جوامێر و خێڵی هەمەوەند لەو کات و وەختەدا دەردەخات .

## ڕاسپاردنی جەنابی مەحموود خانی ناسر الملك بۆ پێشگرتن لە ئاژاوەی هەمەوند و ڕێگەدانی جوامێر بۆ لای خۆی

لەو سەردەمەدا کە ئاژاوە لە سنوری ڕۆمدا سەری هەڵدابوو ، شازادە دەستوری دا بەحکومڕانی عێراقی عەجەم ، بەناوی مەحموود خان (کەلەلایەن شاوە نازناوی ناسر الملکی پێ درابوو) کەبچێت بەریان پێبگرێت . مەحموود خانیش کەئاگاداری بارودۆخی ناوچەکەبوو ، بیستی لەشکری عوسمانیەکان لەناوچەکەدان و هەمەوەندەکانیش ئاژاوەیان ناوەتەوە ، هەستی کرد کەئەم ئاژاوەیە لەوانەیە درێژە بخایێنێت و بگاتە ئێرانیش ، بۆ یە لەگەڵ هەندێ زاناو سوار چاکدا لەشکری پێکەوەناو ڕووی کردە ئەو ناوچەیەو چاوەڕوانی بارودۆخەکەی کرد ، کەبیستی

جـــوامێر لەشـــەڕی ڕۆمـــدا (عوسمـــانی) شـــکاوە و بـــەرەو ئێـــران بەڕێوەیـــە ، دەســتوری ئامــادەبوونی بەلەشــکرەکەی داو وتــی : ڕێگــاو شیوەکانیان لێ بگرن و مەهێڵن کەسیان دەربچێت .

جوامێر کاتێك ئاگاداری ئەمەبوو لەشکری ئێران چاوەڕێی دەکات و بۆی دانیــشتووە ، بــەجارێك دونیــای لێ تاریــك بــوو ، دەبــێ ڕێگاچــارەیەك بدۆزینەوە کەبەزۆر هیچمان پێ ناکرێ ، ئینجا کەسێکی زانای هەڵبـژارد و ناردی بۆ لای لەشکری ئێران بۆ قسەکردن ، ئێمەمیوانی ئێوەین و کەی ڕەوایە لەگەڵ میوان هەڵسوکەوتی ئاوابکرێت و ئێمە بۆ شەڕ لەگەڵ ئێوە نەهاتووین ، بەڵکو هاتووین پەنامان بدەن . ئەگەر پەنامان نەدەن ناچار دەبین بۆ لایەکی تر بچین . کاتێك میر ئەمەی بیست بیری کردەوە ، ئەگەر ئێمەش پەنایان نەدەین ئەوا ڕوودەکەنە لایەکی تر ، بۆیە واچاکە پەنایان بـدەین و کـارێکی وا بکـەین کـەئیتر ئـاژاوە گێـڕی نەکـەن ، باماوەیـەك لـە شوێنی خۆیان بمیننەوە تا بزانین چی دەبێت .

مەحموود خان دەستوری دا بەیەکێك لەسەردارەکانی و وتی : بڕۆ چەند کەسێکیان لێ بێنە تابزانین قسەیان چی یە ؟ لەگەڵ ڕاسپاردەکەی میردا جوامێر خۆی و چەند کەسێکی تر بۆ بارەگای میر هاتن . جوامێر لەبەردەم میردا کڕنۆشی بردو وتی : ئەی میری بەخشندە من چل ساڵە کارم ڕاوو ڕووت و چەتەیی یەو بەلای کاری چاکەدا نەچووم ، تائێستا خۆشیم نەبینیوەو بێزارو پەشیمانم لەم کارانەی کردوومە ، بۆیە ڕووم لەبارەگای تۆکردوەو داوای لێبووردن دەکەم . بڕیار دەدەم لەکرداری خراپە دەست هەڵگرم و لەسێبەری دەوڵەتی ئێوەدا بحەسێمەوە. ئێستا میر دەمان کوژێ عەفومان دەکا سەرمان لە ڕێدایە . میر پێکەنی و وتی : ئەوە چل ساڵە خەریکی چەتەیی و ڕاو و ڕوتی هەزاران کەست کوشتووە کەچی ئێستا دەزانی هیچ ڕێگایەکت نەماوەو حەریفی خۆتت دیوەتەوە ،بەڵام باش دەزانی کەهیچت پێ ناکرێ ، بۆیە کەوتیتە پاڕانەوە بەڵام من دڵنیام کەئەم

ڕەوشتە تامردن لەگەڵ تۆ دایەو هیچ کات واز لەشەڕ ناهێنیت ، بەڵام چونکە پەنات بۆمن هێناوەو خۆت خستۆتە بارەگای شاهەنشاوە منیش وەکو گەورەکان هەڵس و کەوتت لەگەڵ دەکەم . دڵنیابن تا لەموڵکی مندا بن کەس ناتوانێ دەستتان بۆ ببات ، بەڵام بەمەرجێك لەگەڵ لەشکرەکەی ئێمەدا ببی بۆ خزمەت مەسعود پاشا (ظل السلطان) و بەقەدەر ئەو خراپانەی کەکردووتە لەبەر پێیدا کڕنۆش بەری، ئەگەر لێت خۆش بوو، دەتوانی بەئاسوودەیی بژیت . جوامێر کەوتە ناو خەیاڵەوەو ترس دای گرت ، هەربۆیە وتی : دەبێ نووسراوێکم پێبدەی بۆ خزمەتی شەهریار و داوا بکەی لە شاهەنشا نەم کوژێت ، چونکە ئەگەر وانەبێت من پای ڕێگام نییە ، میر نووسراوێکی بۆ کردو ئەوانەشی کەلەڕێ بەجێمابوون لای خۆی گلیدانەوە[٥٧].

## جوامێر چۆن عەفو کرا ؟

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ دەست نووسەکەی حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا، کە باس لە چۆنێتی عەفو کردنی جوامێر دەکات . ڕێحان خانی دایکی جوامێر ئەڵێ : ئەمە قبوڵ ناکەم عالەم هەمووی لەجێو وڵاتی خۆی حەسایەوە بۆ دەبێ هەرتۆ دەر بەدەر بی ، چەند سوارێك لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و لەگەڵ عەزیز بەگی برایدا دەچن بۆ کرماشان . لەوێ خۆی ئەخاتە ژێر لوولەی تۆپەوە ، ئەوکاتە ئسووڵ وابوو هەر کەس خۆی هاوێشتە ژێر دەم تۆپەوە عەفو دەکرا . حاکمی کرماشان ئاگادار دەکەن ئەویش فەورەن تەلەگراف بۆ ناسرەددین شا دەکات حاکمی کرماشان فەورەن تەڵەبی جوامێریش دەکا ، پێی دەڵێ : کە ناسرەددین شا داوای تۆی کردووە .

---

[٥٧] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

جـواميْريش چـەند وڵـاغيْكى ڕەسـەن و مـايينيْكى ڕەسـەن كـە لـە شـەڕى (ساريچە)[٥٨] گرتبووى ، هەروەها چەند دياريـيـەكى نايـاب لەگـەڵ خـۆى بـۆ كرماشان دەبات . چەند دياريـيەك پيْشكەش بە حاكمى كرماشان دەكات . پاشـان لەگـەڵ دوو سـوار بـەرەو ئەسـفەهان دەچـىْ بـۆ خزمـەتى كـوڕى ناسرەددين شـا كـەناوى (ظـل السلطان) بـوو ، لـەويْش چـەند ديـارى يـەك پيْشكەش بە (ظل السلطان) دەكات ، ئـەويش دەڵـىْ : ماشـائەڵا ئەستيْرەت گەشـە لـە خزمـەتى خـۆيـدا تەشـريف ئەبـەن بـۆ تـاران بـە حـزوورى شـامل دەبـىْ ، شـاه فـوق العـادە ئيحترامـى جـواميْر خـان ئـەگريْت . جـواميْر چـەند ڕۆژيْـك لاى ناسـرەددين شـا دەميْنيْتـەوە ، چـونكە ڕوخـسـەتى نـادات كەبيْتەوە . كاتيْك ناسرەددين شـا خەبەرى مايينـە ڕەش دەزانـىْ ، ئـەويش پيْشكەش بە شـاى دەكـا ، خۆلاسـە جـواميْر چـەند ڕۆژيْك لـە ميـوان خانـەى تايبەتى شا دەميْنيْتەوە ناسرەددين شاش لە لاى خۆيـەوە ، يەكـەم جـواميْر عەفو دەكات . دووەم ڕووتبەى سەرتيپى پىْ دەبەخشىْ و لەگەڵ ڕەزامەندى سەد سوار بۆ سەرپيْڵى زەهاو و ناوچەى قەسرى شيرين دەينيْريْتەوە[٥٩] .

## ڕۆيشتنى جواميْر بۆ ئەسفەهان

جواميْر بە دڵە ڕاوكيْوە گەيشتە ئەسفەهان و چووە بارەگـا خـۆى ناسـاند . پيـاوانى بارەگـاى شاهەنـشا چـوونە لاى شـەهريار وئـەويش وتـى : لەدەرەوەى بارەگا جيْگەيەكى بۆ ساز بكەن و داينيْن ، تاكـاتيْكى بـۆ ديـارى دەكەين و لەگـەڵى دادەنيشين . غوڵـام و خزمـەت كارەكـان لـەو شـويْنەدا كـە شـەهريار ديـارى كردبـوو ، جيگايـان بـۆ ڕاخـست و ميـوان دارييـان كـرد . دواى چـەند ڕۆژ شـازادە وەزيرەكـان و زانايـان و سـەردارانى كـۆ كـردەوە.

---

[٥٨] ساريچە : بەكرىْ گيراوەكانى مير .

[٥٩] دەست نووسەكەى حەيدەر عەزيز خەسرەو ئاغا .

سەرداران بە جلوبەرگی تایبەت و غوڵام و خزمەت کارەکانیش بەچەك و ڕەختەوە لە بەردەم بارەگادا ڕیزیان بەست و لە خزمەت شازادەدا وەستان . شازادە دەستوری دا کە جوامێر بهێنن . شازادە وتی : چار نیە کەبەپێی خۆت هاتوویت و داوای لێبوردن لەکەسێك دەکەی ، کەلە مێژوودا ناوبانگی هەیە بۆ چاکەو خزمەت کردن . بەدوای ئەم قسانەدا جوامێر خاکی بەر پێی شای ماچ کردوو ئەویشدەرگای ڕەحمەتی لێ کردەوە ، ناردی جلوبەرگێکی جوانی لەبەر کەن و بیکەن بە سەرهەنگ و بە جوامێر خانیش بانگی بکەن . شەهریار پاش ئەمە کاتبی دەرباری بانگ کرد ، کە بۆ عێراقی عەجەم بنوسێت کەجوامێر خان بۆ لاتان دەنێرمەوە ، لە نزیك سنوری ئێران و ڕۆمدا شوێنیان پێ بدەن ، چونکە لەمەو دوا سەر بەئێمەیە ، ساڵانە شەش هەزار زەڕی ناسری پێ دەدەین و زەوی و زاری بۆ دابین دەکەین ، کە کشتوکاڵی تیادا بکات ، تاسەریان بەوانەوە قاڵ بکەن تالەمەو دوا نەکەونە بیری خراپە . جوامێر کە لە شا مۆڵەتی وەرگرت لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بە دوو سوارە بەرەو کرماشان بەڕێ کەوتن ، کەگەیشتنەئەوێ داواکاریەکەی شایان خستە بەردەستی حاکمی کرماشان ، بەفەرمانی شا دەستور درا کەلە قەسری شیرین بۆ ماوەی دوو ساڵ جێگایان پێبدەن . جوامێر بۆ ماوەی دوو ساڵ دەستی کرد بە خزمەت کردن و هەڵسوکەوتی چاك ، مانگانە دەهەزار درهەمی دەدا بەسوارەکانی ، کە هۆشیان بەماڵی خەڵکەوە بێت و پەیمانەکەی نەشکێنن . جوامێر بەم شێوەیە ڕۆژ بەڕۆژ پلەو پایەی دەچووە سەرەوە ، تا ڕادەیەك کە بووە پارێزگاری هەموو سنوری زەهاو و پلەی سەرتیپی پێدرا ، بەرەبەرە کەبینی لە چادرو ڕەشماڵدا ناکرێ بمێنیبێتەوە ، بۆیە قەسرو تەلارێکی لە بەرد و ساروچ ساز کرد ، کە بتوانێ لەڕۆژی تەنگانەدا بۆ بەرگری کردن لە خۆی بەکاری بێنێت[٦٠] .

---

[٦٠] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محمد علی سلتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ١٣٨٤هەتاوی

## گرتنی فڵامەرز سوڵتان لەلایەن جوامێرەوە

لەو سەرو بەندەدا کە جوامێر عەفو کرابوو ، بەڵام هێشتا نەگەیشتبوە لای (ظل السلطان) ، ئەوە بوو فڵامەرز سوڵتان لە خێڵی گۆران لە حکومەتی ئێران یاخی دەبێت .

ئەوخێمەی ســــــیاە زاغیـــــە

خێمەی فلامەرز لە شا یاخی یە

حکومەتی ئێران هەرچەند دەکەن فڵامەرزیان بۆ چار ناکرێت . هەرچەندە حاکمی کرماشان بە ئۆردوی عەسکەرییەوە لەگەڵ عەشایەری سەنجاوی و کەڵهوڕ ، هەروەها عەلی موراد خانی زەنگەنەدا هێرش دەبەنە سەر فڵامەرز بەڵام بێسود بوو ، بۆیە لەناچاریدا حاکمی کرماشان نامەیەك بۆ جوامێر دەنووسێ لەنامەکەدا دەڵێ : بەخۆت و لەشکرەوە تەشریف بهێنن ، ئەگینا دەبیتە گاڵتەچی هەموو عەشایەری ناوچەکە ! ئیتر کەیفی خۆتە .

جوامێر فەرمان دەدات دەدەن لەتەپڵ و کەڕەناو ، کەهەمەوەند بەمە دەزانن کەنیشانەی شەڕە ، هەموویان لە ئۆردوگا کۆدەبنەوە پێش ئەوەی جوامێر بگاتە کرماشان لە لایەن حاکمی کرماشانەوە خێوەت و خێوەتگای بۆ دادەمەزرێ ، خێوەتەکەی جوامێر لەسەر بەرزاییەك هەڵ دەدرێ وەکو پاشاکانی پێشوو . جوامێر هەر ئەو شەوە بڕیار دەدا کەلەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا فڵامەرزیان بۆ یەخسیر بکات . لەشکری حاکم و لەشکری جوامێر بۆ تاقیبی فڵامەرز دەچن، بەڵام پێش ئەوەی لەشکر بگاتە جێ ، جاسوس هەواڵی لەشکری جوامێر بە فڵامەرز دەدات ، ئەویش بەرەو جوانڕۆ هەڵدێ و بۆ ماڵی حەبیب بەگی باوەجانی دەچێت . هەمەوەند لەوکاتەدا غار لەهەلوول بەر دەداو لەتەپانەوە بنگەزو میرئاوا تا سەربەند دەگرێ و تاڵانی دەکەن. حەبیب بەگی باوەجانی بەپیر جوامێرەوە دەچێ و لغاویماینەکەی دەگرێ ، داوای دەخالەت دەکات .

جوامێر داوا لەحەبیب بەگی باوەجانی دەکاو پێی دەڵێ: ئەگەر فلامەرزم تەسلیم نەکەی ، ئەوا بە گوناحی ئەوەوە تۆش دەسوتێنم ، لەناچاریدا فلامەرز تەسلیم بەجوامێر دەکاو ئەویش دەیداتە دەست حاکمی کرماشان .
لەناو بردنی فلامەرز سوڵتان دەستی جوامێری تێدا بووە[61]

یائیمام رەزا شاگەی خۆراسان

بڕەس و فریاد فلامرز سلطان

حاکم دەیەوێ هەر لەو شوێنەدا فلامەرز بکوژێ ، بەڵام جوامێردەڵێ: ڕەوانەی تارانی بکەن بەڵکو لەوێ عەفوی بکەن و ڕزگاری بێت . پاشان حاکمی کرماشان تەلەگراف بۆ ناسرەددین شا دەکات ئەویش دەڵێ هەر لەوێ بیکوژن . ئەوە بوو لەلایەن سەربازەکانەوە تیر باران کرا[62] .

## چونی جوامێر بۆلای ( ظل السلطان )

ظل السلطان کە حاکمی ئەسفەهان بوو بەم جۆرە باسی خێڵی هەمەوەند دەکا ، کەسەرۆکەکەیان جوامێر و فەقێ قادر بوون . خێڵی هەمەوەند کە لەلایەن جوامێر و فەقێ قادرەوە سەرۆکایەتی دەکرێن ، بەجۆرێك بەسەر زەهاوو دەورو بەری کرماشان دەسەڵاتیان پەیدا کردووە ، کەبوونەتە سوڵتانی ئەو ناوچەیە ، فەوجێك سەرباز بە مەئموری محمد رەزا خان لەلایەن هەمەوەندەکانەوە ڕووت دەکرێنەوە ، هەروەها نزیکەی دووسەد نەفەریشیان لێ دەکوژن . خێڵی گۆران لەلایەن دوو سوڵتانەوە یەکێکیان فلامەرز سوڵتان و ئەوی تر حوسێن عەلی سوڵتان ، کەبەجۆرێك بوونەتە پەشێوی و ئاژاوە لەسەر سنور ، کەباس کردنیان مایەی نەفرەتە . خێڵی کەرەندی و کەڵهوڕی هەزار دەرەجە لەچەلەبی هەمەوەند و گۆران خراپ ترە

---

[61] کەریم سنجابی ، خاطرات علی اکبرخان سنجابی ، ایل سنجابی و مجاهدات ملی ایران ، تهران ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ، لاپەڕە ٦٢ .

[62] دەست نووسەکەی حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا .

جوامێر و فەقێ قادر و کەریم بەهلوول و سەلیم ئەحول کەلە سەرۆکەکانی هەمەوەند بوون ، لەگەڵ شەش سەد سواردا حوسەین قولی خان ئەبو قەدارەی والی لوڕستان ، هەموویانی دڵنیا کردبووەوە بۆ بروجردی نزیک ئەسفەهانی هێنا بوون . هەموویان دەستیان لە کەلەپچەدا بوون ، جگە لە جوامێر و لایەن گرانی . ڕەزا قولی خانی کەڵهوڕ ئازاد کرا بەڵام بڕیار درا لە ئەسفەهان دەست بەسەر بێت . عەلی موراد خان کەرەندی کرایە ڕیاسەت فەوج کەرەندی . داود خان کرایە سەرۆك خێڵ کەڵهوڕ و بۆ ناو خێڵ گەڕایەوە ، فڵامەرز سوڵتان چونکە بێکەڵك بوو لەلایەن سەربازەکانەوە گوللە باران کرا . حوسێن عەلی سوڵتانیش کەلە خێڵی گۆران بوو بەدەست بەسراوی ڕەوانەی ئەسفەهان کرا . جوامێر و سەلیم ئەحۆل درایە دەست میرزا ڕەزا خان و بۆ ئەسفەهانی هێنان منیش بەرەو تاران بۆلای ناسرەددین شای باوکم بردیانم ، لەلایەن باوکمەوە ڕوخسەت دران ، هەروەك چۆن بەڵێنم دابوو کەهیچ کێشەیەکیان بۆ دروست نەبێ ، سوپاس بۆ خوای گەورە لە پێش دەرگای خوا ئەم کارەم بەجێ هێنا . شەوو ڕۆژ خەرجی جوامێر و لایەن گرانیم دابین دەکرد ، هەموویان مۆڵەت دران لەگەڵ والی پشتکۆ بڕۆن . منیش چوار سەد تمەن خەرجیم پێدان ، ئەم کارە لەلایەن خواوە سەری گرت . منیش ئیزنم لەباوکی تاج دارم وەرگرت و بەرەو ئەسفەهان گەڕامەوە[٦٣] .

---

[٦٣] محەمەد عەلی سوڵتانی ، ٢/١ ایلات و طوایف کرماشاهان ، تاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز ، لاپەڕە ٣٩٣-٣٩٤ .

## دانی پلەی والی بە حسام الملك

کـاتێ کـە مـەحموود خـانی ناسـر الملـك بـەرەو ناوچـەی (ڕەی) نـەقڵ کرا ، حسام الملك لەلایـەن شاهەنشاوە کرایە والی کرماشـان ، دونیا پڕبوو لـە عـەدل و داد و وات دەزانـی کـە ئەنەوشیروان حکـوم دەکـات . والی تـازە هەموو فەرمان بەرەکانی بـانگ دەکرد و ئامۆژگـاری دەکـردن ، جوامێریشی لـە زەهـاو بـانگ کـرد و چـەند ئامۆژگارییـەکی کـرد ، تاوەفـا دار بـێ بـەو بەڵێنانەی کەداوێتی . جوامێر بە ڕواڵەت هەڵسوکەوتی باش بوو ، بەڵام لـە دڵـەوە جـۆرێکی تـر ، بەرەبـەرە دەسـتی کـرد بـەزوڵم و زۆر لەخۆیـەوە هـەڵی دەکوتایـە سـەر ئـەم و ئـەو . جـوامێر لـە هـەرکۆێ پیـاوخراپێکی دەدی دەی هێناو دەیکرد بەدۆستی خۆی . کەسانێك لە خێڵی هەمەوەند کەلـەو نـاوەدا خـەریکی چـەتەیی بـوون ، یەکـە یەکـە بـوون بـەدار و دەسـتەی جـوامێر و کورتانیان بە وڵاغیشەوە نە دەهێشت . لەڕێگای نزیك ئەوانەوە کاروانێك لە حەج دەهاتەوە کەشا سپاردبویە دەستی جوامێر ، بەڵام کاتێك کاروانەکە دوور کەوتنـەوە لێیـان و چـەند سـواری خسـتە دوایـان، تـا لەچۆڵەوانیەکدا گەمارۆی کاروانەکەیان داو تاڵانیان کرد . لـەم لاشـەوە بەشـای ووت چونکە دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ مندا دوژمنایـەتیان هەیـە دەیانـەوێ ئابڕووی مـن بەرن . حسام الملك بەرەبەرە بۆی دەرکـەوت کەئەمـە کـاری جوامێرە ، بۆیـە بەدزییـەوە کارەکـانی خـستە ژێـر چـاودێری و ئاگـاداری ، لەمـەش شـای ئاگادار کردەوە کە جوامێر خەریکی چییە(٦٤) .

(٦٤) میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

## هاتنی فەقێ قادر بۆ لای جوامێر

بەهۆی شەڕو ئاژاوەی نێوان هەمەوەندەکای لەگەڵ عوسمانییەکاندا ، ڕێکەوت وابوو لەو کاتەدا کەسێك لە خێڵی هەمەوەند ، کە لە عێراقی عەرەبدا دەژیاو دووسەد سواری لەژێر دەستدا بوو لەگەڵ عوسمانییەکان بەشەڕ هات . کاتێك هەستیان بە شکان کرد بەرەو سنوری ئێران هەڵهاتن ، جوامێریش پەنای پێدان و عوسمانییەکان هیچیان پێنەکرا[٦٥] .

## نووسینی نامە لە لایەن قەیسەرەوە بۆ شاهەنشای ئێران

بەهۆی دەست درێژی هەمەوەندەکان بۆ سەر لەشکری عوسمانی ، سوڵتانی عوسمانی بارو دۆخەکەی وا بینی کاتبی هێناو نووسراوێکی ڕازاوەی بۆ شا نووسی ، کەپڕ بوو لەگلەیی کردن لە هەمەوەند ، کەئەمە مایەی سەر شۆڕییە بۆ هەردوو وڵاتەکە ، بۆیە پێویستە پێکەوە پەیمانێك ببەستین و ئەم ئاژاوانە بشۆرینەوە ، بەتایبەت جوامێر کەزیاتر لە ئیرادەی خۆی پای درێژ کردۆتەوە ، بەپارەی دەوڵەت دەستی داوەتە خەیانەت و کاری ناڕەوا ، من لەشکرێکم ناردەتە ئەو سنورەو کە ڕیشەکێشیان بکات ، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە لەو لاوە پشتیوانیان هەیە هەموو جارێك ڕەنجەکەی ئێمە دەبێ بەهیچ ، ئەگەر ئێمە لەهەردوو لاوە ڕێگایان لێ نەگرین ئەوا ئەم ئاژاوەیە دوایی نایات . کاتێك ڕاسپاردە نامەکەی بردە خزمەتی شاهەنشا زۆر خۆشحاڵ بوو وتی : منیش هەر لەسەر ئەو بیر و باوەڕەم و زۆر پێم خۆشەو سوپاسی نووسراوەکەت دەکەم و هەموو هێزو لەشکرەکەم لە خزمەت تۆدایە. ئێمە ئامادەین بۆ لەناو بردنی هەموو ئاژاوەیەك . ئەگەر ئێوە هێرش بکەنە سەریان ئێمەش لێرەوە ڕێگەیان لێ دەگرین .

---

[٦٥] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

## داخوازی ظل السلطان له حسام الملك

## بۆ لابردن و پاك كردنەوەی ناوچەكە لە ئاژاوە

شاهەنشا نوسراوێكی سەبارەت بە پەیمان شكێنی جوامێر و ڕێگەدان بە هەمەوەندەكان نارده لای حسام الملك و وتی : تۆ دەبێ خۆت بەژێری ئەم ئاژاوە لەناو بەریت و كارێكی وابكەی كە دڵی هەردوو سوڵتانی ئێران و ڕۆم ڕازی بكەیت . لە پێشدا كارێك بكە كە جوامێر بخەیتە داوەوە نەك لە دەستمان هەڵبێت وڕزگاری بێت. منیش چاوەڕوانی سەركەوتن دەكەم .

حسام الملك نووسراوێكی بۆ جوامێر نارد و وتی : ئێمە تۆمان لەوێ داناوە كە پارێزگاری لەو سنورە بكەی ، بەڵام تۆ بێدەنگ دانیشتووی بۆیە من ناچارم لەشكرێك بنێرمە ئەو ناوچەیە ، هەروەها داواكارم لە تۆیش هەموو پێداویستییەك بۆ لەشكرەكەم دابین بكەی و یارمەتییان بدەیت .

## ڕازاندنەوەی لەشكر لەلایەن حسام الملك و ناردنی خان عەلی خان

## لەگەڵ لەشكرەكەیدا بۆ سەر سنور

پاش ئەوەی كە لەشكرەكە ئامادە بوو ڕۆژی دوایی فەرماندەكانی لەشكری كۆكردەوەو هەموویان بۆ فەرمانی نوێی میر ئامادە بوون . حسام الملك بانگی خان عەلی خانی كرد و وتی : لەم لەشكرەدا تەنها تۆم بینیوە كە شایەنی ئەم كارەبیت و بتوانی ببیتە پێشڕەوی ئەم لەشكرە ، كەوابوو تۆ لەگەڵ گروپەكەی خۆتدا بەڕێ بكەوە ئێمەش بەدواتا ڕێ دەكەوین ، خان عەلی خان ئەم فەرمانەی قوبوڵ كرد و خۆی ئامادە كرد .

حسام الملك لەگەڵ لەشكرە پڕ شكۆكەیدا لە شارەوە بەرەو باخی نەشئەت كەوتنە ڕێ . دەستوری دا كەبدەن لە تەپڵی شەڕ . بەدەستوری سالاری كرماشان زەوی لە ژێر پێی لەشكردا ون بوو لەهەموو لاوە خرۆشان . ئەمە لەكاتێكدا بوو كە وەرزی زستان بوو كەش و هەوا زۆر ناخۆش و سارد بوو بەفرێكی زۆر باری بوو . هەوا تەم و مژاوی بوو ئەمیر دەستی كردە

پاڕانەوە لە دەرگای خودا کەلەم شەڕەدا سەر بکەوێت و دوژمنانی دین و خەڵك لەناو ببات . کە بەیانی ڕۆژ بووەوە وخۆر و بان گەرم بوو حسام الملك ئەسپی زین کرد و فەرماندەکانی بانگ کرد و هەریەکەیانی کردە بەرپرسی گروپێك . لەوناوەدا کەسێکی هەڵبـژارد بەناوی میرزا حەسەن خانی مستەوفی کە پیاوێکی گەورەو بەناو بانگ و گەریدەو ئازا بوو ، لەجیاتی خۆی کردی بە فەرماندە و ئینجا بەرەو ماهی دەشت بەڕێ کەوتن . ڕێگا سەهۆڵ بەندان بوو بە جۆرێك کە ئەسپەکان بە هەزار کێشە دەر دەچوون . ئەمیر لە دوورەوە بینی ، کە چەند ژن و پیاوێك لەبەر ئەو سەرمایەدا ڕاوەستاون و هەڵدەلەرزن و زۆری پێ سەیر بوو گەیشتەلایان و وتی : بەم سەرما لەدەرەوە چی دەکەن ، ووتیان ئێمە هیچ ماڵ و موڵکێکمان نییەو لە شار هاتووینەتە دەرەوەو دەمانەوێت ڕوو بکەینە دارستانێك ، تا لەوێ بتوانین ئاگر بکەینەوەو لە سەرمادا ڕەق نەبینەوە . میر زۆری پێ ناخۆش بوو کەئەمەی بینی زۆر سوپاسی خودای کرد کە ژیانی بەو شێوەیە نەبوو ، بۆیە هەرچییەکی لەدەست هات لەنان و پارە و جل و بەرگ پێی بەخشین ، ئیتر بەرەو ڕوبات بەڕێ کەوتن ، لەوێ لەشکرەکەی بارگەو بنەیان خست و لەلایەن خەڵکەوە زۆر پێشوازییان لێ کراو لەبەر پێیاندا قوربانییان کرد . ئەو شەوە لەوێ مانەوە سەرمایەکی زۆر لێیانی داو، میر کەبینی لەشکرەکەی زۆریان سەرما بووەو وتی : ئەمڕۆ لێرە دەمینێینەوە تاکو هیلاکیتان دەردەچێت و بەیانی دەڕۆین . شەوی دوایی بەفرێکی زۆرتر باری ، ئەوەندەی تر وەزعەکەی لێیان تاڵ کرد و ڕێگایان لێ گیرا . بەجۆرێك کە نەبۆ پاش و نە بۆ پێش ڕێگا نەبوو .
کەوتنە ڕاو تەکبیر فاڵیان گرتەوە لە فاڵەکەدا وا دەرکەوت ، کە دەبێ ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن و بڕۆن . لەو کاتەدا لەشکرێك بەڕێوە بوو بە سەرکردایەتی (صوحبت الله خان ) کەهەموویان قارەمان و لێهاتوو بوون لە کرماشانەوە بەڕێ کەوتبوون .

## ڕۆیشتنی لەشکری کەیوان لەماهی دەشتەوە بۆ هارون ئاوا

لەشکری میر ڕوباتیان بەجیٚ هیٚشت و بەو بەفرە بەڕیٚ کەوتن . لەڕیٚگادا دووکەسیان بووە ژیٚر بەفرەوە کە زۆر بەزەحمەت دەریان هیٚنان . دوای ماوەیەك خۆر و بان کەوت و دونیا وردە وردە گەرم داهات ، ئینجا میر کەبینی هەوا خۆش بووە داوای خواردنی کرد . لەوکاتەدا کۆمەڵیٚك کوردی بینی لەو دەشتەدا کەڕیٚگەیان بە بیٚل پاك دەکردەوە ، تا بۆئەوەی لە شکرەکەی میر بتوانیٚ بەویٚدا تیٚپەڕیٚت .

میر زۆر کارەکەیانی لا سەیر بوو بۆیە دەست خۆشی لیٚیان کرد و خەڵاتیانی کرد . ئەگەر چی ڕیٚگا زۆر سەخت و ناخۆش بوو بەڵام بە ئومیٚدی خودا ئەو ڕیٚگا سەختەیان بڕی .

کاتیٚ گەیشتنە نزیکی دووەمین ڕیٚگا زەوی ڕەش بوو لە پیاوانی خیٚڵی سەرتیپ ، کەلەو ڕۆژەدا بۆ پیٚشوازی کردن لە میر و سەرتیپ هاتبوون ، هەردووکیان پیٚکەوە بۆ نویٚژچوون . پاشان پیٚکەوە گفتوگۆی زۆریان کردو ، سەرتیپ میواندارییەکی باشی کردن و هەموو جۆرە پیٚداویستییەکی بۆ دابین کردن . میریش لەمە زۆر خۆشحاڵ بوو .

## نووسینی نامە لەلایەن جوامیٚرەوە بۆ مهر عەلی

پاش ئەوەی کەلەشکری حسام الملك گەیشتە سەرپیٚڵی زەهاو ، جوامیٚر کەوتە کۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕیٚکانی خۆیی و تەکبیر کردن . جوامیٚر وتی: میر لەشکرەکەی هیٚناوەتە دەشتی زەهاو لەویٚ خیٚوەتی هەڵداوە و هیٚزیٚکی زۆری لەگەڵ خۆی هیٚناوە و مەبەستیان لەم هاتنە شەڕە . ئیٚمەش دەبیٚ لەبیری خۆماندا بین ، ئەگەر بیٚتە ئیٚرە لەوانەیە شەویٚك هەڵبکوتیٚتە سەرمان و هەموومان بکوژن ، ئەگەر من بەرەو پیٚشوازی بڕۆم دیسان ترسی ئەوەم هەیە کە فیٚڵمان لیٚ بکەن ! ئیٚوەدەڵیٚن چی ؟ .

خەلیفە کە پێشەوای ئایینی ئەوان بوو بەجوامێری وت : پیاوێکی زانا هەڵبژێرە کەبتوانێت بچێتە لای میر و دڵی نەرم بکات و پێی بڵێ ، ئەگەر هەموومان بکوژێ ئۆف ناکەین ، چونکە لەلای تۆ ئۆف کردن تاوانە ، ئەگەر خزمەتێك بەئێمە دەکرێت تاکو خزمەت گوزاریت بکەین ، ئەگەر لێمان خۆش بوو ئەوا دەمێنینەوە و خزمەت دەکەین ، ئەگەر نا بڵاو دەبینەوە بەدەشت و کێودا و لەگەڵیان بەشەڕ دێین و لەمە زیاتر هیچ ڕێگە چارەیەکی ترمان نییە . جوامێر دەستی کردە بیر کردنەوەو خەزورێکی بوو کە پیاوێکی زۆر دڵسۆز و چاك بوو بەناوی مهر عەلی خان کە برای ئەبو قەدارەی والی لوڕستان بوو . بۆیە نامەیەکی بۆ نووسی و پاش ئەحواڵ پرسی ئاگاداری کردەوە ، کە حسام الملك لەشکری هێناوەتە سەرمان و دەیەوێت لەگەڵمان وەشەڕ بێت و بمان کوژێت . بۆیە داوات لێ دەکەم کەنامەیەك بۆ سالاری کرماشان بنووسی ، ئەگەر نیازی وایە هێرش بکاتە سەرمان ناچارین هەموومان هەڵبێین . ئەگەر زانیت کە میر لەمن دڵگران نییەو نووسراوێکم بۆ بکە کەمن پێشوازی لێبکەم ، ئەگەر زانیت لەمن دڵگرانە ئاگادارم بکە تاکو ڕزگارمان بێت لەم بەڵایە .

نامە گەیشتە لای خان لوڕ و زۆر نیگەران بوو . هەربۆیە کردێیە سەر میر و وتی : جوامێر لە خۆشەویستان و خزمەت کارەکانی تۆیە لەو سنورەدا و بۆچی لەشکر دەبەیتە ئەو شوێنە ؟

من داواکارم ئەگەر خەیاڵی شەڕت لەگەڵیان هەیە ، عەفو یان بکەی ، ئەگەر ئەم کارە بکەی ئامادەیە کە بۆ خزمەتتان بێت .

## وەڵامی نامەی مهر عەلی خان بۆ جوامێر و هاتنی بۆ ئۆردوگای میر

مهر عەلی خان بە دڵێکی پڕهیوا و ئومێدەوە هاتەوە ، وەڵامی نامەکەی بۆ جوامێر ناردەوە و وتی : خەمت نەبێ کەبەخت لەگەڵتایە . جوامێر نامەکەی خوێندەوە و دڵی زۆر شاد بوو ، ئینجا هاوڕێکانی کۆکردەوە و بەرەو لای میر ڕێگای گرتە بەر و دووسەد کەسی لەگەڵ خۆیدا برد ، کە هەمووی کوڕی چاك چاك کاتێك ڕوویان کردە دەشتی زەهاو و بینی لەهەرلاوە خێوەت هەڵدراوە دڵی داخورپاو وتی : ئەم لەشکرە لەخۆیەوە نەهاتووە و من خەریکم بەدەستی خۆم بەرەو گۆڕ دەچم . هەر بۆیە بەهاوڕێکانی وت : کەمن دەڕۆم بەرەو خێمەکەی میر و ئێوەش لەدەوری لەشکرەکەدا خۆتان حەشار بدەن ، ئەگەر زانیم جۆرێکە هەر کەشمشێرەکەم شەوقی دا لە هەموو لاوە هێرش بکەنە سەر لەشکرەکەو ماوەیان پێ مەدەن و لە مردن مەترسن ، چونکە ئاکامی دونیا جگە لەمردن شتێکی تر نییە .
جوامێر وردە وردە بەرەو لای خێمەکەی میر بەڕێ کەوت و سەری بۆ دانەواند و لەبەردەم میردا داوای لێبوردنی کرد . میر پێی وت : تۆ خەمت نەبێ بۆشەڕ لەگەڵ تۆ نەهاتووم ، بەڵکو لەلایەن شای عەجەمەوە هەواڵمان پێگەیشتووە ، کەلە سنوری کەرکوکەوە پیاوێکی دلێری کورد کەخێڵ و عەشیرە و سوارێکی زۆری لەگەڵدایە ، لەگەڵ سوڵتانی ڕۆم ناکۆکی هەیە و هەڵهاتووە لەم ناوچەیەدا خۆی حەشار داوە . بۆیە داواتان لێدەکەم لەگەڵ چەند سوارێکدا بڕۆن و لە خاکی ئێران دەریان بکەن . ئەمە خواستی شای جیهانەو دەبێ ئەم کارە بەباشی ببەی بەڕێوە و ئاژاوە گێڕ لەم سنورەدا نەهێڵیت . جوامێر وتی : شا فەرمانی چی بێ من هەرئەوە دەکەم و سەر و ماڵم لەڕێگەی ئەودایە . جوامێر بەم شێوەیە هەڵس و کەوتی کرد و دڵی میری هێنایە جێ ، میریش بەنەرمییەوە لەگەڵیدا دوا . میر وتی : ئەم شەو لێرە بمێنەوە و بەیانی بەرەو ئەوناوچەیە بچۆو ئێمەش بەدواتا ڕێ دەکەوین . بەم شێوەیە جوامێر لە خێمەکە هاتەدەرێ و تۆزێك بێ خەم بوو.

## ڕاسپاردنی جوامێر بۆ دەرکردنی فەقێ قادر
## لە خاکی ئێران

ڕۆژێك دوای خۆر كەوتن لەشكر سانیان گرت و میر گەورەی خێڵەكانی بانگ كرد و هەموویانی خەڵات كرد . پاشان جوامێری بانگ كرد و وتی : فەرمانی شا ئەوەیە كەلەناوچەی كەركوك كەسێك بەناوی فەقێ قادر لەگەڵ قەیسەری ڕۆمدا بەشەڕ هاتووە و لەشكری كۆكردۆتەوە ، شای عەجەم داوای كردوە كەئەم گروپە شەڕ خوازن و دەبێ لە ئێران دەربكرێن و بدرێنەوە دەست سالاری ڕۆم . تۆ لەگەڵیان دۆستی و خۆیشت لەوانی ، دەبێ واز لە دۆستایەتییان بهێنیت ، پێویستە فەرمانی شا بەجوانی بەڕێوە ببەیت ، ئەگینا ئێمە خۆمان هەڵدەستین بۆ لەناو بردنیان .

جوامێر كەئەمەی بیست زانی كەهیچ ڕێگا چارەیەك نەماوە سەری بەرز كردەوە وتی : ئەگەر چی ئەوان خزمی منن ، بەڵام فەرمانی شا لەلای من گرنگە و دەچم هەموویان دەكوژم .

جوامێر لە پاش ئەمە گەڕایەوە بۆ شوێنی تایبەتی خۆیی و كۆبوونەوەیەكی ساز كرد ، هەتا پرس ورای هەموان سەبارەت بەم مەسەلەیە بپرسێت .پاشان ڕووی كردە هاوڕێكانی وتی : لەگەڵ پرسیارێكی زۆر ناخۆشدا ڕوو بەڕوو بوومەتەوە ، ئەویش شەڕ كردنە لەگەڵ خزمی خۆم ، كەئەمە وەكو لەكەیەكی نەنگ هەتا هەتایە دەمینێتەوە ، ئەگەر بەقسەی ئەوانیش نەكەم ، خراپ ترم بەسەر دێنن و تاسەرم نەكەن بەدارەوە لێم ناگەڕێن .

یەكێك لە هاوڕێكانی جوامێر وتی : ئەی گەورەم دڵ لەدڵ مەدە ، بەڕواڵەت لەگەڵ خزمەكانی خۆتدا شەڕ بكەو لەژێریشەوە لەگەڵیان دۆست بە[٦٦] .

---

[٦٦] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

## بەڵگەنامەی عوسمانی سەبارەت بە فەقێ قادر

پاش ئەوەی لە ساڵی ١٨٨٦.ز فەقێ قادری هەمەوەند بە خۆیی و دووسەد سوارەوە لەلایەن ئێران و دەستەی جوامێرەوە تەنگەتاو دەکرێن ، ئینجا بەرەو لای عوسمانییەکان دێن و داوای عەفو دەکەن .

ئەمەش یەکێك لە بەڵگەنامە عوسمانییە گرنگەکانی ساڵی ١٨٨٦.ز سەبارەت بە هەمەوەندەکان دەڵێ :

بەڵگەنامەی ژمارە (٢٦)

لە (٧) جمادی الاولی ساڵی ١٣٠٤ی کۆچی ژمارە (٤٨٨)

قبوڵ کردنی چەتە هەمەوەندەکان کەلە ئێرانەوە هاتوون و نیشتەجێ کردنیان: ((ڕاکردنی یەکێك لەسەرانی چەتە هەمەوەندەکان کەناوی فەقێ قادرە بەیاوەری ٢٠٠ سوار ، ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی ئەو تەلەگرافانەی لە موسڵەوە پێمان گەیشتوون ، هەروەها بەگوێرەی بروسکەی ڕۆژی (٧) ی جمادی الاولی ساڵی ١٣٠٤ی کۆچی سوپای شەشی عوسمانی ، چەتەکان داوای داڵدەدانیان لە دەوڵەتی باڵاکردووە ))

**لەبەر ڕۆشنایی ئەم تەلەگرافە ئەم بڕیارە درا :**

( لەبەر ڕۆشنایی بروسکەی ناوبراو ، فەقێ قادر کە ٢٠٠ سواری لەگەڵدایە قبوڵ کراو بڕیار درا هەمەوەندەکان کەلە سنورەوە ڕایان کردووە داڵدەبدرێن . ڕێو شوێنی پێویست پەیڕەو کراوە و ئەو جێیانەش دیاری کراون کە چەتەکانی تێدا نیشتەجێ دەکرێ . ویلایەتی موسڵ و وەزارەتی ناوخۆ و سەر عەسکەریش لەم بارەیەوە ئامادە کرانەوە )[٦٧] .

---

[٦٧] دکتۆر عەبدوڵا عەلیاوەیی ، کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ، سلێمانی ، چاپی یەکەم ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ١٠٥ .

## ڕاسپاردنی جوامێر لەلایەن ئەمیرەوە بۆ گرتنی حەسەن کوڕی ڕەحیم

ئەو کۆمەڵە هەمەوەندەی کەلەگەڵ فەقێ قادر بوون ، هەمیشە لەلایەن عوسمانییەکان و ئێرانەوە ڕاو دەنران ، کاتێ عوسمانییەکان دەکەنە سەر ئێران کە فەقێ قادر و جەماعەتەکەی تەمێ بکرێن ، ئێرانیش دەکاتە سەر جوامێر کەلە ئێران دەریان بکات . یەکێك لەو پیاوە ناودارانەی هەمەوەند ناوی حەسەن کوڕی ڕەحیم دەبێ ، جوامێر کەئەمەی پێ دەڵێن ئەویش ئیسماعیل خانی برایی و عەزیز بەگی شەرەف بەیانی بۆ گیان حەسەن دەنێرێت . حەسەن پیاوێی ئازاو بەغیرەتەو خۆی بەتەنیا لابۆ دووسەد سوار ناکاتەوە .

هاوڕێکانی جوامێر لەژێرەوە حەسەن ئاگادار دەکەنەوە ، کاتێك کەئێمە بەرەو لات هاتین تۆش هەڵبێ ، سوارەکانی جوامێر کەهاتنەوەو وتیان هەتا ئێمە چووین ئەوان هەڵهاتن . میر کە زانی فێڵیان لێکردووە ئیسماعیل خانی خستە زیندانەوە[٦٨] .

## هەڵبژاردنی شا موراد خان بۆ شەڕ لەگەڵ حەسەن

لە خێڵی هەمەوەندەکانی کرماشان پیاوێکی زانا و زیرەك بەناوی شا موراد خان، کەخۆشەویست و گەورەی هەمەوەندەکان بوو . ئەم پیاوە هەڵبـژێردرا بۆشەڕ لەگەڵ حەسەن . شاموراد لەبەردەم میردا کڕنۆشی برد و وتی : من دەچم حەسەن قۆڵ بەست دەکەم و دەیهێنمە لای جەنابتان . شاموراد ئەمەی ووت و هاتەدەر و چەند پیاوێکی ئازای لەگەڵ خۆی برد ، پاشان ڕوی کردە ئەو شوێنەی کەئەوانی لێ نیشتەجێ بوون .

---

[٦٨] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

**کاتێك گەیشتە جێ ، نەڕاندی و وتی : لەکوێی ؟ من هاتووم بۆ شەڕ لەگەڵ تۆ تا کۆتایی بەژیانت بێنم . دووسوار بەپڕتاو بەرەو لای شاموراد هاتن ، بەڵام پێش ئەوەی بگەنەجێ یەکێکیانی بە فیشەك کوشت .**

**یەکێك لەسوارەکان کەئەمەی بینی و نەڕاندی و هاتە مەیدانی شەڕ و وتی : ئەوە کێ بوو توانیتی ئەم پاڵەوانە بکوژێت .**

**شاموراد کەئەمەی بیست نەڕاندی بەسەریدا و وتی کەم لافی ئازایەتی لێبدە ، ئەوا من هاتم لەگەڵ ئەمەداو فیشەکێکی دا لەقۆڵی ڕاستی و لەگەڵ ئەمەیان بینی ، حەسەن و هاوڕێکانی بڵاوەیان لێکرد شاموراد و هاوڕێکانی سەری کوژراوەکەیان بڕی و سەرکەوتوانە بۆ بەردەمی میر هێنایانەوە[٦٩] .**

## ڕۆشتنی جوامێر لەگەڵ گروپێك سوارەی گۆران
## بۆ دەر پەڕاندنی سوارەکانی فەقێ قادر

**ڕۆژی دوایی کەخۆر دەرکەوت ، میر بانگی جوامێری کرد و پێی وت کەلەو خێڵە زۆریان ماون ، بەشێك لەلەشکرەکەی من ببەو لە خاکی ئێران دەریان بکە . جوامێر لەگەڵ گروپی گۆران و بەفەرمانی میر شەو و ڕۆژ لەو ناوچەدا مانەوە ، تاقیان لێ بڕین و هەرکەسێکیش بەدیل گیرا بۆلای میر هێنایان ، میریش ئەم کارەی زۆر پێ خۆش بوو[٧٠] .**

---

[٦٩] **میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ،ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .**

[٧٠] **هەمان سەرچاوە .**

## نووسینی نامە لە لایەن قەیسەرەوە
## بۆ شاهەنشای ئێران

بــــەهۆی دەســــت درێــــژی هەمەوەنــــدەکان بــــۆ ســــەر لەشــــکری عوسمـانی ، سـولتانی عوسمـانی بـارو دۆخەکـەی وا بینـی کـاتبی هێنـاو نووسـراوێکی ڕازاوەی بـۆ شـا نووسـی ، کـەپڕ بـوو لەگلـەیی کـردن لـە هەمەوەنـد ، کەئەمـە مایـەی سـەر شـۆڕی بـوو بـۆ هـەردوو وڵاتەکـە ، بۆیـە پێویستە پێکەوە پەیمانێك ببەستین و ئەم ئاژاوانـە بشۆرینەوە ، بەتایبەت جوامێر کەزیاتر لـە ئیرادەی خۆی پـای درێـژ کردۆتـەوە ، بـەپارەی دەوڵـەت دەسـتی داوەتـە خەیانـەت و کـاری نـاڕەوا ، مـن لەشـکرێکم ناردەتـە ئـەو سنورەو کە ڕیشەکێشیان کات بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە لەو لاوە پشتیوانیان هەیە ،بۆیە هەموو جارێك ڕەنجەکەی ئێمە دەبێ بەهیچ ، ئەگـەر لـە هـەردوو لاوە ڕێگایان لێ نەگرین ئەم ئاژاوە دوایی نایات . کاتێك ڕاسپاردە نامەکەی بردە خزمەتی شا ئەویش بەخۆشحاڵی یەوە وتـی : منیش هـەر لەسـەر ئـەو بیرو باوەڕەم و زۆرم پێ خۆشـە و سوپاسـی نووسـراوەکەت دەکـەم ، هـەموو هێـز و لەشـکرم لەخزمـەتی تۆدایـە ، ئامـادەین بۆلـەناو بردنـی هـەموو ئاژاوەیەك . ئەگەر ئێوە هێرش بکەنە سەریان ، ئێمـەش لێرەوە ڕێگایـان لێ دەگرین[71] .

---

[71] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

## سەردانی محەمەد پاشای داغستانی
## بۆ کرماشان و دارِشتنی پیلانی لەناو بردنی جوامێر

سەرداری ڕۆم نامەیەکی بۆ حاکمی کرماشان نووسی . کەمن ئاواتم ئەوەیە کە ڕۆژێك پای شەهریاری ئێران ماچ بکەم، هەروەها پێکەوە قسەبکەین و دەعوەتی بۆ ڕۆم بکەم ، تابتوانین لێرە میوان داری بکەین و لەخزمەتی دابین ، میر وڵامی سەرداری ڕۆمی دایەوە وتی: من لەفەرمانی شا لانادەم و بەشای ڕادەگەیەنم، ئەگەر ڕوخسەتی دام ئەوادێم .

لەلای مەسعود شاوە پەیام هات کە داوا لەمیری کرماشان دەکات ، کە ئەو دەعوەتی سەرداری ڕۆم بکات . سالاری ڕۆم وتی من لە لایەن پور شاوە دەستوری هاتنم نیە بۆ ئێران ، ئەگەر تۆ پێت خۆش بێت ئەوا ئێمەش حەز دەکەین ببیت بە میوانمان ، ئێمە لە سنوری ئێران و ڕۆمدا هەرچیت پێ خۆشبێ وادەکەین .

میر و لەشکرەکەی بەرەو سنور بەڕێ کەوتن ، لەو لاشەوە هەواڵ درا کە سالاری لەشکری ڕۆمیەکان وا خەریکە بەرەو لات دێت . میر دەستوری دا کە ئێوەش زۆر بەگەرمەوە پێشوازیان لێ بکەن . گەورەکان لەسەر فەرمانی میر هەرکام بەنۆبەی خۆیان بەگەرمی پێشوازییان کرد . لەپێشدا سوارەکانی سەنجاوی و پاشان صحبت الە خان ، لەگەڵ سێ سەد سواردا و دوای ئەو حوسەین خان لەگەڵ سەد سواری هەمەوەندا پێشوازییان کرد[٧٢].

هاتنی محەمەد پاشای داغستانی بۆ ئێران بەمەبەستی پیلان دارِشتن بوو، کە جوامێر لەناو بەرن ، بەمەش لەگەڵ حسام الملك حاکمی کرماشان پێکەوە ڕێك کەوتن ، کاتێك محەمەد پاشا دەگاتە قەسری شیرین ، جوامێر هیچ گرنگی پێنادات و پێشوازیشی لێ نەکرد .

---

[٧٢] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

هەرچەندە محەمەد پاشا کە نیازی بوو سەردانی جوامێر بکات ، ئەمە ئەوەندەی تر محەمەد پاشای ڕق ئەستور تر کرد ، تا زیاتر بیر لەوە بکاتەوە جوامێر زووتر لەناو بچێت[٧٣] .
حسام الملك و محەمەد پاشا کاتێ پێکەوە دانیشتن ، سالاری ئێرانی وتی : دەرگای هەوانە زێڕەکان بکەنەوە و ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسی پێشکەش بە محەمەد پاشا کرد ، هەروەها خەڵاتی دا بەهەموو لەشکری ڕۆم و هەموویانی خۆشحاڵ کرد . بەم شێوەیە سالاری ئێران و ڕۆم چەند شەو بەخۆشی لەگەڵ یەك پێکەوە بوون ، دوای ئەو ماوەیە محەمەد پاشا بۆ ڕۆم (عێراقی عوسمانی) گەڕایەوە .
جوامێریش پاش ڕۆشتنەوەی محەمەد پاشا کەوتە کۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕێکانی وتی : دانیشتنی سالاری ئێران و ڕۆم تەنیا لەبەر لەناو بردنی ئێمەیە .
ئێمەش دەبێ لەبیری ڕێگەچارەیەکدا بین ، جوامێر وتی : وابەباش دەزانم شەو لەناوەختدا هەڵکوتینە سەریان و لەچوارلاوە هێرشیان بۆ بەرین ، ئاگر لە خێمەو خێوەتیان بەردەین و پاشان بچینە کێوی بەمۆ ، ئەگەر کەسیان مایەوە دیسان هێرش دەکەینە سەریان و تاقیان لێدەبڕین .
کەسێك لەدار و دەستەکەی جوامێر کە ئەمەی زانی هەمووی پوخت بۆ ئەمیر تومان گێڕایەوەو ئاگاداری وەزعەکەی کرد . هەرلەوکاتەدا تەلەگراف کرا کەدەبێ جوامێر و دار و دەستەکەی هەموو دیل بکرێن و بۆ بارەگای شا بیان هێنن ، میر کەئەمەی بیست زۆر شاد بوو ، جلی شەڕی پۆشی و ئامادەی شەڕ بوو ، کاتێ جوامێر ئەمەی زانی دەرپەڕی و ڕووبەڕووی میر بووە وە .

---

[٧٣] دەست نووسەکەی حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغا .

میر (حسام الملك) کەئەمەی بینی نەڕاندی و وتی : هێرش بەرنە سەریان و زەوی بشۆن بەخوێنیان ، کەلەشکر فەرمانی میریان بیست لە چوار لاوە دەرکەوتن و هێرشیان هێنا .
لەم لاشەوە جوامێر و دار و دەستەکەی تێوە چوون. لەشکری میر کە جوامێریان بینی پیادەیە و بەسەر ئەسپەوە نیە . لەچوار لاوە دەوریان دا . حوسەین خانی فەراش باشی وەك و شێر نەڕاندی و کەمەنی بۆ خست و دای بەزەویدا . دەست و پێیان بەست و کۆتیان خستە مل ، باقی سوارەکانی جوامێر هەرچی کوژران ئەوانەشی کە مانەوە هەڵهاتن . سوارەکانی میر شوێنیان کەوتن ، دوونـاودار لەخێڵی سەنجاوییەکان کەناویان خەسرەو و شێر خان بوو، کەوتنە دوای سوارەکانی جوامێر و دەستیان بەکوشتنیان کرد، لەناکاو خەسرەو فیشەکێکی بەر کەوت و سوارەکانی میر گەیاندیانە شوێنێك بۆ دەرمان کردن . لە لایەکی ترەوە سوڵتان گۆران (عەلی سوڵتان قەڵخانی) فیشەکێك بەر خۆی و ئەسپەکەی کەوت ، پاشان لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە ، بە پیادەو بێ ئەوەی گوێ بدا بریندارە شەڕی دەکرد . یەکێك لە سوارێکی جوامێر کەبینی پیادەیە کەوتە شوێنی و دەست ڕێژی لێکرد کە بیکوژێ ، بەڵام سوڵتان گۆران خۆی دایە پشت بەردێك و لەناکاو بۆی دەرپەڕی و غەرقی خاك و خوێنی کرد . ئەو ڕۆژە تانزیك نیوە شەو شەڕکرا و سوارەکانی عەشیرەتەکانی کرماشانیش یارمەتییان دەدان ، زۆریان کوشتن و بەسەرکەوتویی بەرەو لای میر گەڕانەوە(٧٤) .

---

(٧٤) میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ،ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

## هێرش كردنە سەر قەڵای جوامێر لەلایەن حسام الملك

حسام الملك و خۆیی و لەشكرەكەی لە هەموو لایەكەوە هێرشیان كردە سەر قەڵای جوامێر و دەوری قەڵاكەیان دا . میر كاتێك كەبینی چەكدارەكانی ناو قەڵاكە بەرگری دەكەن ، تۆپێكی هێناو بەرەو ڕووی دەروازەی قەڵاكەی دابەست و دەروازەكەی بەتۆپ لە ڕیشە دەرهێنا ، لەشكر چونە ناو قەڵاكەوە هەموو كەس و كارەكانی جوامێریان بەدیل گرت ، ژن و منداڵەكانیان سپاردن بە كوێخایەك ، هەرچی پیاوەكانیشە هەموویانی لە زیندان توند كرد . میر كاتێك كەئەم سەركەوتنەی بینی دەستی كرد بە پاڕاندنەوەو وتی: خودایا ئەم شكۆو شانازییە تۆ پێت دام ، ئەم سەركەوتنە تۆ كردت بەنسیبی من ، خودایا زۆر سوپاست دەكەم[٧٥] .

بەر قەڵای جوامێر كریاوە پەمە
جوامێر بەخەنجەر توركان بەقەمە

## بەخاك سپاردنی ئەو كەسانەی كەلەم شەڕەدا كوژران و ناردنی مەحموود خانی سەنجاوی بۆ گرتنی براكەی جوامێر

میری دلێر تەلقینی شەهیدانی خوێند . هەموو ئەو كەسانەی كە كەسێكیان بەدیل گرتبوو خەڵاتی كردن . لەخێڵی سەنجاوییەكان كەسێكی بەناوی مەحموود خان نارد بۆ دەشتی زەهاو بۆ گرتنی براكەی جوامێر . مەحموود خان چەند سواری لەگەڵ خۆی برد و بەڕێكەوت لەگەڵ سوارەكانی براكەی جوامێردا ڕوبەڕوی یەكتری بوونەوە ، لەنێوانیاندا پاڵەوانێك هەبوو بەناوی حەیدەری كاكە ڕەش ، كەهاتە مەیدانەوە یەكێك لە سوارەكانی مەحموود خان فیشەكێكی پێوەناو دەشت و دەری لەخوێن سور كرد . دوای ئەمە

[٧٥] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

کوڕێکی حوسێن خان هاتە مەیدانەوە ئەویش کوژرا . دوژمنان بۆیان دەرکەوت کەناتوانن بەرەنگار ببنەوە ناچار هەڵهاتن ، ئەمانیش سەری ئەو دوو کەسە کوژراوەیان هێناو خستیانە بەر پای میر[٧٦] .

## ناردنی کلبعلی خانی کێشگچی باشی بۆ گرتنی جافەکانی مورادی

میر یەکێك لەگەورەکانی بەناوی کلبعلی خان هەڵبژاردو وتی : بچۆ بۆ شەڕ لەگەڵ خێڵی جافی مورادی (ئەمە بەرەی ئەو جافانە بوون کە کاتی خۆی حەمەپاشای جافیان کوشت) لەناویان بەرە ، کلبعلی خان بەرەو خێڵی جاف بەڕێ کەوت و لەگەڵیان ڕوبەڕو بوو وەوە پێش ئەوەی لەخەو هەستن هەموویانی دیل کرد ، کەمیر ئەمەی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو سەدان ئافەرینی لە کلبعلی خان کرد[٧٧] .

## هاتنی دەستور لە لایەن شەهریار تاج بەخشەوە بۆ میری دلێر کەجوامێر و هاوڕێکانی بکوژێت

ڕۆژی دواتر لەلایەن ناسرەددین شاوە دەستور هات بۆ میر و دەڵێ : جوامێر و هاوڕێکانی بکوژەو ڕەحمیان پێ مەکە ، هەروەها سەریان ببڕە ، میری دلێر کەئەم تەلەگرافانەی پێگەیشت دەستوری دا بەیانی ئەو ڕۆژە بەناوی شاهەنشاوە خوتبەیەکی خوێند ، سەری دیلەکانیان بڕی و لەگەڵ کاروانێك ڕەوانەی ئەسفەهانیان کرد و بەم شێوەیە ئەم بەسەر هاتە کۆتایی پێهات .

هەرکەس ئەو سەرانەی دەبینی خۆشحاڵ دەبوو ، بەم شێوە میر بەرەو لای شا ڕێگەی گرتەبەر، کەگەیشتنە کرماشان شار پڕ بوو لە هەل هەلەو

---

[٧٦] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

[٧٧] هەمان سەرچاوە .

خۆشـــی ، ژن و منداڵەکانیـــشی ئـــازاد کـــردن و دایـــە دەســـتی کوێخایـــەك لەقەسری شیرین[78] .

| | |
|---|---|
| گـــروهی زیـــاران دیو شـــریر | کـــه بودند در بند محنت اســـــیر |
| بریدند از تن ســـر نابـــــــكار | زمین گشت از خونشـــــان پرنگار |
| خـلیفه که بد قاضـــی آن گروه | کز او بود در حیله شیطان ستوه |
| بریدند سر از تنش خـــوار زار | ســـــر آمد بندان بدگهر روزگـــار |

## پێشبینی لاچین دەربارەی نەمانی جوامێر

لاچین کەلە دەروێشەکانی پەیڕەوی مەزهەبی ئەهلی حەق بوو ، لەسەردەمی جوامێر دەژیا ، لەکۆمەڵە شیعرێکیدا کەبەناوی لاچینەوە بەناو بانگە باس لەوە دەکات ، کە جوامێر یەك ساڵی تردەژی ، واتە کۆتـایی بەژیانی دێـی و فـــەوت دەکـــات . ئـــەم قـــسەو باســـەی لاچـــین لـــەناو خەڵکـــدا بڵـــاو بووەوە ، جـوامێریش کـاتیێ بەمـەی زانـی بـانگی لاچین دەکاو پێـی دەڵـێ : ئەگـەر پـێش بینییەکـەت ڕاسـت دەرنەچـوو ئـەوا دەسـتوور دەدەم پێـستت داماڵن و پڕی لە کا بکەن . لاچینیش لەوەڵامدا دەڵێ : دە ڕۆژ پێش ئەوەی تـۆ لـەناو بـچیت مـن دەمـرم ! دووکـەس جەنازەکـەم بـە وڵـاغ بـۆ یارگـەدار (نعمـان) ئەڵوەنـد ، کـەمێك لـە خـوار پردەکـەی ئێـستاوە دەمشۆن و بـەخاکم دەسـپێرن . ئەوانـەی ئـەم قـسەیەیان گێڕاوەتـەوە هـەموو شـایەتی لەسـەر ڕاستی ئەم ڕووداوە دەدەن .

[78] میرزا ئەحمەد ئیلهامی (محەمەد عەلی سوڵتانی) ، فەتحنامەی حسام الملك ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .

ئەمەش شیعرەکەی لاچین[٧٩]:

لاچین حواله

حکمی نـــــه باطن به ین حوالــه

پیر مـــــوسی نەیان مُهر نه قوالــه

بستانو لـــــیشان وعده یکسالــه

چبگ چـــــــابگی چفتی چلبــی

نگـــــــین داوود مُهر حلبــــی

داوود تعیین بی چـــون باز شاهین

نیشت نفرق سر ســـردار خائیــن

مـغزش بر اُورد و چنگال و چنگ

ذاتــش پیچنا و حــــطیطه تـــن

مُــهر حــــــلبی سَندِشان چنـــه

قـــوای خره دیز بخشاشان پنـــه

تمــام بی تاریخ شر اُرای شر جــو

پیکـــیاو تیر قُلـــــه دالاهــــو

لاچین خــــــبردار نجم باطــــن

وعـــده یکساله پیرموسی ضـامـن

---

[٧٩] نەریمان سوبحانی ، کتێبی شهر باستانی قصرشیرین ، کرماشان ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ، لاپەڕە ٥٧–٥٨ .

# چەند بەڵگە نامەیەك دەربارەی جوامێر

**بەڵگەنامەی یەکەم**

**ژمارەی بەڵگە : ٧٢**

**بابەت : دور خستنەوەی جوامێر ئەحمەدەوەند (هەمەوەند) .**

**مێژوو ١١ ربيع الثاني ١٣٠٤ هـ . ق**

**بەڵگەنامەیەکی سیاسی ئێران بۆ سەفارەتی گەورەی عوسمانی دوێنێ لەگەڵ بەڕێزتان دەربارەی جوامێر گفتوگۆمان کرد ، لەم بارەوە دەست نووسی باوەڕ پێکراوی سوڵتان (ناظم الملك) دەرچوە ، بریتییە لەوەی کەناوچەی قەسری شیرین و زەهاو و دەورووپشت لە زوڵم و زۆری هەمەوەندەکان دەناڵێنن . بۆ ئاسایش و ئەمنی ڕێگاو بان جوامێر ئاگادار دەکەینەوە ، بەبڕێك پارە ڕایان دەگرین و مافیان پارێزراوە ، موچەیان بۆ دەبڕینەوە تا ئەو کاتەی لەلایەن (باب عالی) یەوە بەڵگەی ڕەسمیمان پێدەگات و دڵنیامان دەکەن لەوەی کەوا جوامێر و لایەن گرانی دوور خراونەتەوە ، یان لەناو بران یان بۆ ویلایەتی دوور تر دوور خرانەوە . هەرچەندە ئەمەش لەڕووی سیاسی و شەخسی جوامێرەوە گرنگ نیە ، بەڵام ئەو و لایەن گرانی هەمیشە لە دەست درێژی و شەرەنگێزی بەردەوامدان ، کاری ئەمانە وای کردوە کە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا ڕەنگی تری گرتوە کە (وکلای عظام) دەوڵەت لە عوسمانییەکان بەتەواوی لەئەمن و ئاسایش سنور مەئیوس بووە . لەم بارەیەوە ئەگەر ئەمانە دەر نەکرێن تاوانی زیاتر ڕوو دەدا ، ستەم لێکراوان و ستەم کاران وەك خۆیان دەمێننەوە ، ئەگەر ئەوانە بەبێ سزا ڕاببورن ئەوا لەوانەیە، کەهەلیان بۆ هەڵکەوت جارێکی تر خۆیان بگەیەننە سەر خاڵی سنور ببنە هۆی شەڕو ئاژاوە ، خاکی ئێمەو ئێوەش بکەنە جێگای پەلامارو هێرش بردن .**

**لەدوور خستنەوەیان تەنها ئەمن و ئاسایش مەبەستمانە ، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە داد وەری و ئینساف و مافی خەڵك و وەفاداری ببێتە**

حـاكم ، هەریـەك لەهـەردوولا بـە ئـەمن و ئاسـایش بەسـەر بـەرن . ئـەولیای فەخامی ئێران دەیانەوێ ئەم كارە بن بڕ بكرێت[٨٠].

بەڵگەنامەی دووەم :

ژمارەی بەڵگە : ٧٣

بابەت : دوور خستنەوەی جوامێر ئەحمەدەوەند (هەمەوەند) .

هەڵبژاردەی بەڵگەی سیاسی ئێران و عوسمانی ( ج ، ٢ ، ٧ ) .

نامەی باڵوێزی عوسمانی لەئێران بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران

نامەی بـەڕێزتان كەلـەكاتی ١١ ربیع الثـانی ١٣٠٤ هـ ، ق دەرچـوە دەربـارەی دانیـشتنی مـن و بـەڕێزتان لـەبارەی جـوامێر و لایـەن گرانییـەوە، كـەڕۆژی چوار شەممە (١٠) ی ئەم مانگـە كـرا . بەئاشـكرا ڕای دەگەیـەنم كـە دەوڵـەت دەربارەی جوامێر و لایـەن گرانـی هـەرگیز مووچەیان پـێ نـادات ، هـەروەها هیچ بەڵگەنامەیەكیان پێ نادات بۆ سازش ، دەبێ لـە ئێـران دەر بكـرێن یـان تەسلیم بكرێن یاخود لە سنور دوور بكرێنەوە ئەمە بۆچونی(باب العالی) یە.

ئەگەر ئێمەش بەتەرازووی عەدل و حەق سـەیر مەسـەلەكان بكـەین لـەڕووی سیاسییەوە دەبو كارێكی وامان بكردبایە تا ئـەو هـەموو زیـان و خەسـارەتە دووبارە نەبوایە ، بەڵام باب العالی سورە لەسـەر ئـەوەی كەهـەرگیز سـەنەد و موچە بەم جۆرە كەسـانە نـادات . هـەركات ویـستان بـۆ دورخـستنەوەی یـان دەركردنـی جـوامێر ئـەوا ئێمـەش ئامـادەین ، بـەڵام ئێـوە ئەگـەر ویـستان بـۆ شاری ئەسفەهان دووری بخەنەوە ، ئەوا ئێمەش ڕازی دەبین .

---

[٨٠] حەیدەر بهتۆیی ، كورد و پراگندگی او در گستره ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ، لاپەڕە ٢٤٤ .

**بەڵگەنامەی سێیەم :**

**ژمارەی بەڵگە : ٧٤**

**بابەت : زوڵم و زۆری هەمەوەندەکان**

**مێژوو : ١٣٠٤ هـ ، ق**

**هەڵبژاردەی بەڵگەنامەی سیاسی ئێران و عوسمانی (ج ، ٢ ، ٧٠٣)**

**نامەی صدر الأعظم (أمین سولطان) بۆ حاکم کرماشان**

**تەلەگرافی جەنابی عالی گەیشت لە تێبینییەکانی ڕابردوودا دەڵێ : یەکەم هەرچی دەربارەی دیلەکانی هەمەوەندە کەسی تر مەنێرن هەرچی تر هەیە لەگەڵ ماڵ و منداڵی جوامێر لای خۆتان لە کرماشان ئاگاداریان بن . دووەم : دەربارەی هەمەوەندەکان(باب العالی) دەفەرموێ : زۆر مەحاڵە کەلەنێوان سلێمانی و موسڵ جێگایان بۆ دابین بکەین ، بەڵام ئەوەی پێویستە لەم بارەوە لە ئەستەمبوڵ و تاران لەگەڵ سەفارەتەکان گفتوگۆ دەکرێت ئێوەش ئاگادار دەکرێن[٨١].**

**حاجی سەیاح لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (خاترات حاج سیاح) ەوە یە لە لاپەڕە (٢٢٩) دا . لەسەفەرێکدا بۆ قەسری شیرین باسی ئاو و هەوای ئەو ناوچەیەدەکات و دەڵێت : قەسر جێگایەکی زۆر خۆشە ، بەڵام ئێرەش وەکو زۆر جێگای تر پیسە ، پیاو سەری سوڕ دەمینێ لەو خێزانانەی کە ساڵانە زیاتر لەسەد هەزار کەس جگەلە کاروان و بازرگانەکان هەر میوان و زیارەت کەر بۆ ئەو ناوچەیەدێن و تێپەڕ دەبن . خەڵکانی دەوڵەمەند و پیاوی زاناو شازادەکان و بازرگان ، هەروەها خەڵکانی تری ئێرانی کەلەو شوێنانەدان دەمانەوەو هاتووچۆیان بەسەرێیەوە بوو ، بۆ چی کەس بیری لەوە نەکردۆتەوە کەشوێن و حەسانەوەی باش و خاوێن ، هەروەها میوان خانەی دڵ ڕفێن و خواردەمەنی و کەل و پەلی باش لەوێدا ئامادە بکات ، تا**

---

[٨١] حەیدەر بهتۆیی ، کورد و پراگندگی او در گسترە ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ، لاپەڕە ٢٤٨ .

ببێته هۆی حەسانەوەی خەڵك و خۆشی قازانجێکی باشی دەست بکەوێت.
بەهەر حاڵ لەکۆشکی باخی نوێی حکومەت نیشتەجیٚ بووین ، پاشان بۆ سبەی سوارەکانی عەلی مورادخان ئێمەیان گەیاندە پردی زەهاو ، بەه بەه چ جێگایەکی باش و چ هەوایەکی لەباری بۆ کشتوکاڵ و دار و درەخت هەیە . لەسەردەمی پاشاکانی ساسانی ئەم شوێنە پڕ بوو لەئاوەدانی و قەڵەباڵغی ، لەسەر پردەکە نیشتەجیٚ بووین زۆر پیس بوو ، ویستم لەزەهاو بگەڕێم و کەمێك گەشت و گوزار بکەم ، کاتیٚ لەگەڵ یەکێکدا ڕۆیشتم هەندیٚ چادر و ئەسپی بەسراوەم بینی کە دیار بوو لەکەسانی جوامێر بوون ، مرۆڤ دۆستی و میهرەبانییان نواند . وتیان (کچەکەی بەسەد سوارەوە ئامادەی شەڕ دەبێت) .
جوامێر تفەنگ و فیشەك دانەکەی پیشان داین ، ئەم جوامێرە سەرۆکی خێڵی هەمەوەند بوو ، کەلەسەر سنورەکانی عوسمانی و ئێرانی دژایەتی هەردوو لایانی دەکرد .
جوامێر هەندێك جار بەناوی خەڵکی ڕەش و ڕووت (ڕەعیەت) ی عوسمانییەوە شاڵاوی بۆ سەر ئێران دەبرد ، هەروەها زۆر جاریش بەناوی ئێرانی بوون سەرکێشییان بۆ سەر وڵاتی عوسمانی دەکرد .
جوامێر لەلایەن ناسرەددین شاوە موچەو بەخششی پێدرا بوو ، هەروەها فەرمان ڕەوایەتی قەسری شیرین و زەهاو ، هەروەها پاراستنی ڕێگاو بانیشیان بەو سپاردبوو .
جوامێر لە قەسری شیرین کۆشکی هەبوو هەروەها دەستەیەکی ئازاو نەبەردی لەگەڵدا بوو[٨٢] .

---

[٨٢] حەیدەر بهتۆیی ، کورد و پراگندگی او در گستره ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ، لاپەڕە ٢٥١ .

حاجی سەیاح لە ساڵی ١٣٠٢ی مانگی ١٢٦٣ی هەتاوی لەدوای زیارەت کردنی کەربەلا بەرەو ئێران دێتەوە ،لەلایەن جوامێرەوە لەقەسری شیرین زۆر ڕێزی لێدەگیرێت .

سەفەری دووەم کەبەنیازی زیارەتی کەربەلا بوو لە ڕێی (تویسرەکان) و (کەنگاوەر) و کرماشانەوە هاتە ناو قەسرەوە هیچ شتێکی تازەی نەبینی جگەلەوەی کە حوسێن خانی حسام الملك لە دوای سوێند خواردن بەقورئان و دڵنیاکردنی تەواو ، جوامێری کوشتبوو ، ماڵ و حاڵی بەتاڵان بردبوو ، هەوەها ژن و منداڵەکانی دەستگیر کردبوو .

حاج سیاح پاش گەڕانەوەی لە زیارەتی کەربەلا بەرەو وڵات ، کاتێ بەرەو کرماشان دەچێ ، کەئەو کەسەی فڵامەرز سوڵتانی بەبێ تاوان کوشتبوو، هەروەها ئەو شەرمەزارییەی بەسەر ماڵ و منداڵی جوامێردا هێنابوو (پاش تاڵان کردنی ماڵ و سامانیان) ، لەگەڵ ئەو هەموو پارەو پولەی پێکەوەی نابوو ئێستا خۆی لەخاکی ڕەشدا نووستوو وەو میرات گرەکانی سەرقاڵی بەش کردنی ئەو ماڵ و سامانەن[٨٣] .

## پێشینەی مێژوویی و ڕووداوە مێژووییەکان

یەکێك لە ڕووداوە مێژووییەکانی سەردەمی شاموراد خانی ئەحمەدەوەندی بهتۆیی بریتی یە لەوەی، کە یەکێك لە کوردەکانی عێراقی ئێستا کە ناوی جوامێری ئەحمەدەوەندچەلەبی بوو، لە ساڵی(١٨٨٠ . ز)(١٢٩٨)ی کۆچی هێزێکی پێکەوە نابوو، دەشتی زەهاو و قەسری شیرینی کردبوو بە شوێنی چالاکی خۆی ، هەروەها قەڵایەکی قایم و پایەداری دروست کردبوو بە ناوی ئەوە وە ناسرابوو . بەپێی پێویستی بارودۆخەکە لەکاتی مەترسیدا جارێك خۆی بەئێرانی یان عێراقی دەناساند . لەو سەردەمەدا کۆمەڵێ لە

---

[٨٣] حەیدەر بهتۆیی ، کورد و پراگندگی او در گستره ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ، لاپەڕە ٢٤٠-٢٤١ .

بنەماڵـەی شـازادەکانی قاجـار بەمەبەسـتی زیـارەت بـۆ شـوێنە پیرۆزەکـانی کەربـەلا و نەجـەف دەچـن ، لەلایـەن چـەکدارەکانی جـوامێرەوە کەوتنـە بـەر هێرش و هەموویان ڕووت کردنەوە . ئەوانیش وازیان لەڕۆیشتن بۆ زیـارەت هێناو بەرەو ئێران گەڕانەوە . ناسرەددین شـایان ئاگـادار کـردەوە کەبەهـۆی نەبوونی ئەمن و ئاسایشی ڕێگاو بانەکانی وڵات ، شتێك ڕوویداوە کە بۆتـە هۆی بێحورمەتییەکی زۆر بۆ بنەماڵەی قاجار . ناسرەددین شا بـە خێرایـی نامەیەك بۆ حوسێن خانی حسام الملك دەنووسێ و داوای دەستگیر کردنـی جـوامێری لێـدەکات . هـەروەها داوای پاراسـتنی ڕێگـا و بانـەکانی کـرد بەمەبەستی هاتوچۆی زیارەت کەرەکانی کەربەلا . حاکمی کرماشـان هـەموو سـەرۆك خێڵـەکانی ناوچـەکەی بـانگ کـرد و لەگەڵیانـدا لـەبارەی دەسـتگیری جـوامێرەوە ڕاوێـژی کـرد ، پاشـان بـە (شـا مورادخـان) ی سـپارد کـەیان دەستگـسری بکـات یـان بیکوژێـت . هـەروەها داوای لـە خێڵـەکانی تـری ناوچـەکە ، زەنگەنـە ، کـەڵهوڕ ، کولیـایی ، سـەنجاوی ، گـۆران کـرد کـە هاوکاری پێویستی بکەن . شا موراد خان نامەیـەکی بـۆ جـوامێر نووسـی بەمەبەستی گفتوگۆ و دیـداری ئێـوە ، ئەگـەر ئێـوە ڕازیـن ئـەوا ڕای خۆتـان بنێـرن . قاسید کەوتـە ڕێ و گەیـشتە ناوچـەی قەسـری شـیرین ، نامەکـەی گەیانـدە جـوامێر و پـاش وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی ئـەویش گەڕایـەوە لای شـا موراد خان . شاموراد خان ژمارەیەك لە پیاوانی ئازاو لێهاتووی خێڵەکانی هەڵبـژارد بـەرەو قەسـری شـیرین کەوتنـە ڕێ . لـە ڕێگـا لەگـەڵ هاوڕێکـانی دەربـارەی مەبەسـتەکەی خـۆی وتـی : یـەکێك لـە ڕێگاکـانی سـەرکەوتن لـە جەنگدا ، سوود وەرگرتنە لە سیاسەت ، بەواتایـەکی تـر بـەکار هێنـانی فڕو فێڵ لە جەنگدا . نیازم وایە بەبێ ئەوەی شەڕو پێکدادان ڕوو بدات جوامێر دەسـتگیر بکـەم ، بەشـێوەیەك لـەکاتی دانیـشتنەکەماندا پـەتی تەزبیحەکـەم دەبچڕێنم . پاشان هەموو تان خەریکی کۆکردنەوەی دەنکەکانی تەزبیحەکە بـن . کاتێـك کـە جـوامێریش لەگـەڵ ئێـوە خـەریکی کـۆ کردنـەوەی دەنکـە

تەزبیحـەکان دەبـیٚ ، بەخەنجـەر لـە پـەل و پـۆی دەخـەم . هاوڕێکـانی شـا موڕادخـان هـەموویان ئامادەیی خۆیـان بۆ ئـەم کـارە دەربڕی . پـاش چـەند ڕۆژیٚ چونە ناو قەسری شیرین ، بەهۆی هەواڵ نێرێکـەوە گەیـشتنی خۆیـان بـە جـوامێر ڕاگەیانـد . جـوامێر پێـشوازی لێکـردن و پێکـەوە لـە خێمـەی فەرماندەییـدا کۆبوونـەوە . پـاش نـان خـواردن و پـشوودان بـە پێـی پیلانـی پێشتری (حسام الملك) ، لەدوای سوێند خواردن بە قورئان و دڵنیا کردنـی تـەواو ، جـوامێر هاتـە نـاو دانیـشتنەکەوە . لـەکاتی گفتوگـۆ کردنـدا شـا موڕادخــان پــەتی تەزبیحەکــەی خــۆی بــچڕاند و هــەموویان خــەریکی کۆکردنـەوەی دەنکە تەزبیحـەکان بوون ، جوامێریش یارمـەتییانی داو هـەر لەم کاتەدا شا موراد خان بە جوڵاندنەوەیەکی خێرا خەنجەرەکەی خۆی بە دڵـی جـوامێردا کـردوو بـەبیٚ ئـەوەی دەرفـەتی بـەرگری کردنـی بداتیٚ ، لـە (٢٠ / ئەسفەندی ١٢٦٦ مانگی) سەری لە لەشی جیا کردەوە .

دوای کـوژرانی جـوامێر هاوڕێکـانی شـاموڕادخان بەسـوود وەرگـرتن لـە وەزعـی جـوامێر ، ناوچـەکەیان ئابڵوقـەداو هەڕەشـەیان داو هـەموویانیان ناچار کرد کەخۆیان بەدەستەوە بدەن . دوای تەسلیم بوونی هەمەوەندەکان بە پێی ڕێکەوتنی شا موڕادخان لەگەڵ خێڵەکە بەرەو ئەو دیوی سنور واتـە جێی نیشتەجێی خۆیان گەڕانەوە ، ناوچەکە هێمن و ئـارام بـوو وەوە . شـا موڕادخـان لـەدوای دانـانی دەسـتەیەك بۆ ناوچەکە بەسـەر کەوتنـەوە بـەرەو کرماشان بـەڕیٚ کـەوت . کاتێك هـەواڵی ئـەم سـەرکەوتنە گەیـشتە حوسـێنی حـسام الملـك ، لەگـەڵ پیـاوانی شـار بـۆ پێـشوازییان هاتنــە دەرەوەی شار ، کەبەیەکتری گەیشتن دەم و چاویان ماچ باران کردوو هەواڵەکەیان بە تەلەگراف بە ناسرەددین شا گەیاند، هەروەها سەری جوامێریشیان بەهۆی تەتەرێکەوە بۆ نارد[٨٤] .

---

[٨٤] حەیدەر بهتۆیی ، کورد و پراگندگی او در گسترە ایران زمین ، تاران ، ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ، لاپەڕە ٢٥١- ٢٥٢ .

## چۆنێتی کوشتنی جوامێر

قاجارییەکان و عوسمانییەکان هیچیان پێنەکرا ، کەوتنە پیلان گێڕان و لە ئەنجامدا توانیان جوامێر لەناو بەرن ... لە ڕێگای حسام الملك حاکمی کرماشانەوە ، سەرۆك عەشیرەتی هەمەوەندی ئێران (شا مورادخان) بۆ جێبەجێ کرنی ئەم کارە هەڵبژێرا ، پیلانەکەش بریتی بوو لەوەی کە شامورادخان هەمووپیاوە ئازاکانی خێڵەکانی زەنگەنە، کەڵهوڕ، کولیایی ، سەنجاوی ، گۆران ، دەورووبەری کرماشان لە خۆی کۆ بکاتەوە بیان کات بەسوارەی خۆی، ئەوە بوو بەناوی خزمایەتیەوە داوای لەجوامێر کرد ، کە گوایە بۆ میوانی دەچێتە خزمەتی و کێشەی نێوان ئەو و دەوڵەتی ئێران بنەبڕ دەکات . کاتێك شامورادخان دەکەوێتە ڕێ بەلایەن گرانی خۆی دەڵێ کاتێ گەیشتینە ماڵ جوامێر تەزبیحەکەی خۆم دەبچڕێنم و جوامێریش بۆ دەنکەکانی دەچەمێتەوە ، ئەوسا لەپشتەوە بەخەنجەر دەی کوژین . ئەوە بوو ئەم پیلانە سەری گرت . سەری جوامێر و چەند هاوڕێیەکی دەکەن بەنوکی ڕمەوە بەدیاری بۆ ئاغاکانیان دەبەن . لەڕۆژنامەی(صور اسرافیل) پێنج شەممە جمادی الاخر(١٣٢٥)ی کۆچی هاتوو وە کە کوژرانی جوامێر بە دەسیسەو پیلانی ئینگلیزەکان دەزانن(٨٥) .

ژاك دومورگان لەبارەی کوشتنی جوامێرەوە دەڵێ : کاتێك حسام الملك خۆیی و لەشکرەکەی بەرەو قەسری شیرین هاتن . لەلایەن جوامێرەوە پێشوازی گەرم دەکرێن ، پێش ئەوەی جوامێر بگاتە چادرەکە دەیگرن و سەری لە لەشی جیا دەکەنەوە . ئەوانەی لە قەڵاکەی جوامێردابوون تا چەند ڕۆژێك لەگەڵ ژنەکان بەرگرییان لە خۆیان کرد . ژمارەیەك زۆر سەربازی ئێرانیان کوشت . سەر ئەنجام بەهۆی گوللە تۆپێکەوە کەدیواری قەڵاکەی کون کردبوو (١٨) کەس لە ئەفسەرەکانی جوامێر کوژرا بوون بە

---

(٨٥) محەمەد عەلی سوڵتانی ، ٢/٢ ایلات و طوایف کرماشاهان ، تاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز ، لاپەڕە ٦٨٣ .

جوامێرەوە ژمارەیان گەیشتە (١٩) کەس . سەریان پڕ لە کا کراوڕەوانەی تاران کران [٨٦] .

## هۆکاری کوشتنی جوامێر

جوامێر تائەوکاتەش کوژرا پلەی سەرتیپ و حاکمی قەسری شیرین و ناوچەی زەهاو بوو . هۆکاری کوشتنەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاتێك کچی ناسرەددین شا بۆ زیارەتی کەربەلا و نەجەف بەڕێ دەکەون. لە نێوان خانەقین و قەسری شیرین ڕووت دەکرێنەوە ، ئەو کاتە بنەماڵەی شا لە ئەمەن و ئاسایش ڕێگا و بان دڵنیا بوون ، چونکە پاسەوانی ئەو سنورە لەلایەن جوامێرەوە پارێزگاری لێدەکرا ، پاش ڕوودانی ئەم کارەساتە کچەکەی شا نامەیەك بۆ باوکی دەنووسێ و دەڵێ : خۆشەویستەکەت ڕووتی کردینەوە . ناسرەددین شا کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت ، ئەویش هەموو پێداویستییەکی بۆ کچەکەیی و ئەوانەی لەگەڵیدابوون ڕەوانە کرد ، هەروەها لەو لاشەوە داوای لەحاکمی کرماشان کرد کە هەڵسێت بە گرتن و لەناو بردنی جوامێر . حسام الملك حاکمی کرماشان کە زانی توانای شەڕ و بەرەنگار بوونەوەی لەگەڵ جوامێردا نییە ، بۆیە کەوتە پیلان داڕشتن ، ئەوە بوو خۆیی و لەشکرێکی گەورە قۆناغ بە قۆناغ بەناو پاراستنی سنور کەوتە ڕێ ، ماوەیەکی زۆری خایەند تاگەیشتە قەسری شیرین دواتر لەنزیك قەڵاکەی جوامێر لەخوارووی ڕۆخانەوە کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای قەرەنتییەوە[٨٧] بەرامبەر گوندی نەسر ئاباد لەسەر تەپۆلکەیەك کەبەرامبەر قەڵاکەی جوامێر بوو ئۆردوگایەکیان دروست کرد . جوامێر هەر لەهەوەڵەوە هەستی بەمەترسی

---

[٨٦] نەریمان سوبحانی ، کتێبی شهر باستانی قصرشیرین ، کرماشان ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ، لاپەڕە ٥٧ .

[٨٧] قەرەنتییە : وشەیەکی فەڕەنسییە ، بەمانای شوێنی حەوانەوەی ڕێبوار دێت .

کرد ، چونکە زانی شتێك لە گۆڕدایە ، بەڵام فێڵ و سوێند خواردنی حسام الملك ، هەروەها لەگەڵ نامەکەی خەزوری جوامێریان ئارام کردەوە .
چەکدارەکانی جوامێر گەلێك داوایان لەجوامێر کرد کەئەم لەشکرە وا لەنزیك قەڵاکەی جوامێرەوە مۆڵی خواردووە بێ هۆ نەهاتووە . زۆربەی چەکدارەکانی جوامێر خۆیان دەدزییەوەو بەرەو بازیان دەهاتن ، ڕۆژ بە ڕۆژ چەکدارەکانی جوامێر کەم دەبوونەوە .
حسام الملك کەبینی جوامێر دەوری چۆڵ بووە چەکدارێکی کەمی لەگەڵدا ماون ، بۆیە کەوتە جێ بەجێ کردنی پیلانە پێش وەختەکەی کەدای ڕشتبوو ، ئەوەش بریتی بوو لەدەعوەت کردنی جوامێر بۆ ئۆردوگاکەی و لەپڕێکا هەڵمەتیان بردە سەری و کوشتیان. پاشان هێرش کرایە سەر قەڵاکەو توانرا پاش شەڕێکی خوێناوی دەست بەسەر قەڵاکەدا بگرن هەرچی تیابوو یەخسیریان بکەن. هەر لەوێدا چەند کەسێك کە سەر بە جوامێر بوون سەریان لە لەشیان جیا دەکرێتەوە .
دوای کوشتنی جوامێر بە دوو مانگ لیژنەی لێکۆڵینەوە دێت بۆیان ساغ ئەبێتەوە ، کەجوامێر بێتاوان بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە ڕوت کردنەوەی کچی شاوە نەبووە . کاتێك کچی شا ئەمەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە سەر داوای ئەو جوامێر کوژراوە ، داوا لە باوکی ئەکات کەپاداشتی بنەماڵەکەی بداتەوە ، ئەوە بوو ناسرەددین شا ژن و منداڵەکانی جوامێر بۆ تاران بانگ ئەکات . ناسرەددین شا زۆر دڵخۆشییان ئەداتەوە ، چونکە جوامێر بە هەڵە کوژراوە ، پاشان کچێکی برازای کەناوی قەمەرناز دەبێ پێشکەش بە حەمەخانی کوڕی جوامێر دەکات . لەتۆڵەی خوێنی باوکی . چەند ساڵێك لە تاران پێکەوە دەژییان ، بەڵام دوای ئەوەی کە خزمەکانی لە تورکیا و وڵاتی شام و تەرابلوسی ڕۆژئاوا (لیبیا) لە نەفی گەڕانەوە ، چوون بەشوێن حەمەخان و هێنایانەوە بۆ گوندی عەلی مەنسوری نزیك چەمچەماڵ ، ئەویش لە قەڵا کەی باوکی نیشتەجێ بوو . گوڵعوزار کچی

جوامێربوو هەمیشە باسی ماڵی خۆیان و ناسرەددین شای دەکرد. لە گێڕانەوەیەکیدا دەڵێ : ناسرەددین شا بەشێك لە کۆشکەکەی خۆی دابوو پێمان ، کاتێك کە ناسرەددین شا بۆ دەوام دەچوو پانزە سوار لەپێشەوە و پانزە سوار لەدواوە ڕێگایان بۆ پاك دەکردەوەو هەیبەتیان دەپاراست .
ناسرەددین شا چوار ژنی هەبوو ، هەروەها سێ جارییەی هەبوو .
(باڕون ئیدوارد نۆڵد) بەم شێوەیە باسی کوشتنی جوامێر دەکات : سوڵتان لە جوامێر خۆش نەبووە ، چونکە ئەم ئاغایە نەیویستووە سەری بۆ شۆڕ بکات . تورکەکان داوایان لە ئێران کردووە ئەم پیاوەیان بداتەوە . چەند ساڵێك ئەم تەقەلا و کۆششە بێ بەر بوون ، چونکە ئێران نەیویست جوامێر بدات بەدەست تورکەکان ئەمەش سوڵتانی ناڕەحەت کردووە بۆیە هەر سور بووە لەسەر داواکەی ، ئێران ناچار بوو بە شێوەیەکی ناجوان ئەم ئاغا هەمەوەندە بفەوتێنێت ، گوایە هەمەوەندەکانی ناوچەی سلێمانی گێرە شێوێنن و ئاژاوە بەرپا ئەکەن هەر بۆ ئەم مەبەستە لەشکری عوسمانی بە سەرۆکایەتی محەمەد پاشا هاتووە و لەوێ جێگیر بووە . لەلای ئێرانیشەوە ظل السطان لەناوچەکە پەیدا بووە . جوامێر ئاغا لەلایەن ئێرانەوە بۆ ناوچەکە نێردراوە تا لەگەڵ هاوڵاتییەکانی خۆیدا ناوبژی بکات . کەچی وەك دەرکەوت تاوەکو ئەوکاتە هەمەوەندەکان هیچ گێر و گرفت و ئاشوبێکیان نەخوڵقاندبوو ، دیارە مەسەلەکە هەر لەسەرەتاوە ڕەنگی بۆ ڕێژراوە . ئەوەی لێرەدا عەقڵنابڕێ ئەمەیە جوامێر ئاغا بە تەواوی لەسایە و لە ژێر دەستی شادا بووە ، ئەگەر بیویستایە بیکوژێ ئەوا ئەمە وەکو ئاو خواردنەوە وابووە و پێویستی بەم هەموو پرۆسە دووروو درێژ و شانۆییە نەکردووە . ئەمە بەڵگەیەکە بەسوود و قازانجی شا تەواو دەبێ و دەری دەخات شا ڕاستەوخۆ دەستی لەم کوشتنەدا نەبووبێت ، لەوانەشە ڕووداوەکە لەلایەن محەمەد پاشا و (ظل السلطان) ڕەنگی بۆ ڕێژرا بێت

هـــەروەکو دۆســت و ئاشــنایانی جــوامێر و هاوڵاتیــان کــە ئەوســا لـــەوێ کۆبوونەوە پێشبینییان کردووە کارەساتەکە هەروا قەوماوە و ڕوویداوە .
بە شێوەیەکی خیانەت کارانەو ، ناجوان و بەئامادەبوونی محەمەد پاشا (مەبەست لە محەمەدپاشای داغستانی بەغدا) یە . جوامێر لە خێوەتەکەی جێنشینی تەختی سەڵتەنەتی فارسدا کوژراوە ، هەواڵی ئەم کارەساتە خوێناوییە دەست بەجێ بڵاو بۆتەوە و دەنگی داوەتەوە ، دەست بەجێ خەڵکەکە پێیان زانیوە . ژنی جوامێر ئاغا لەنزیکەوە چاوەڕێی کردووە بزانــێ دانــشتنی نــاو خێوەتەکــەی (ظــل الــسلطان) و محەمــەد پاشــا و مێردەکەی چی لێدەبێتەوە ، بەبیستنی هەواڵی کوژرانی مێردەکەی بووە بە فەرماندەی هەمەوەندەکان و لە محەمەد پاشا پڕ بووە و دەماری گیراوە و بەرچاوی تاریك بووە . پاشا تورکەکەی بەهۆ و بەرپرسی لەناوچوونی مێردەکەی داناوە و ئوباڵەکەی خستۆتە ئەستۆی ئەم سەرکردە تورکە .
کاتێك محەمەد پاشا گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا ئەم کەڵە ژنە بەپیاوەکانییەوە کەوتۆتە دوایی و سوارە چەکدارەکانی پاشای عوسمانیان وەك ئاردی ناو دڕك پەرش و بڵاو کردەوە و وەك کەوی برابرایان لێ هاتووە ، پاشا خۆیشی ئەگەر تیژڕەوی و چاپووکی ئەسپە ڕەسەنەکەی نەبوایە (ئەسپەکەی ناوی مانیك بوو) ئەوا لەدەست ئەم ژنە قووتار نەدەبوو . پاش سێ ڕۆژ ڕاونان کەنزیکەی (٣٠٠)کیلۆمەترە ڕێگا بووە ، فەرماندە تورکە کە بەهانکە هانك گەیشتۆتە نزیك شاری بەغدا و بە پەلەپڕوزە خۆی بەدەروازەی شاردا کــردووە و قووتــاری بــووە . وەکــو بۆیــان گێڕامــەوە ئــەم بێوەژنــە و پیاوەهەمەوەندەکان تا دەروازەی شاری بەغدا ئەو سەرکردە تورکەیان ڕاو ناوە و ڕتاندوویانە . لەدوایدا ئەسپەکەی محەمەد پاشا کەوتە دەست من[٨٨] .

---

[٨٨] باڕۆن ئیدوارد نۆڵد (وەرگێڕانی دکتۆر حەمید عەزیز) گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز ، لاپەڕە ١٢-١٣-١٤ .

## شیعری محمد سعید نەجاری (ئاسۆ) ١٣٨٥ی هەتاوی بۆکان

### جوامێر خان

بـــــەناوی خودای دەهەنـــدەی داوەر
خـــــالقی ئەرز و سەما و بەحرو بـــەر
یـــــاران ببیستن ئـــەم نەزمی نامـــە
هەرچەند مــــــەنزومە کاری تەمامــە
بــــــەڵام بزانن مێژووی کورد چۆنـــە
کـــــورد چۆن ژیاوە لەم خاکە کۆنــە
هەمیشە ژێردەست ڕۆم وعەجەم بوون
پیـاوی جوان بیر و ئازامان کەم بـوون
گەرپیاوێ بووبێ دەیان گووت یاخین
لـــەدین دەرچونە کـــافر و تاغـــین
دەبینن جارێ بەپـــــەنای خـــودا
دژی ڕۆم وەستا شــــا عوبێـــدوڵا
هـــەر لەئێرانیش لـــەورمێ و ماکـۆ
مـــــەشهورە ناوی سـمایل سمکـــۆ
ئـــەم جوامێر خانەش یەك لەوانەیـە
تـــــاڵان و بڕۆ یـــــەك بەهانەیــــە
لـەوسـەردەمەدا تـــاڵان باو بـــووە
تاڵان چی سـیفەت ئازا و پیاو بـووە
یاران لەم قەرنە مـــەحکومیان مەکەن
بەر تیری تانەی ئـــــەمڕۆیان مـــەدەن

**شمارهٔ سند: ۷۲**
**موضوع: تبعید جوانمیر احمدوند**
**تاریخ: ۱۱ ربیع‌الثانی ۱۳۰۴ هـ.ق**
[گزیدهٔ اسناد سیاسی ایران و عثمانی، ج ۲، ۶۹۷]

**مراسله به سفارت کبرای عثمانی [نامهٔ وزارت خارجه]**

دیروز که با آن جناب جلالت مآب در باب جوانمیر مذاکرهٔ شفاهی می‌نمودیم، دوستدار برای طی این مسئله دستخط آفتاب نقطه همایونی را روحنافداه که در ختم راپورت معتمدالسلطان ناظم‌الملک شرف صدور یافته و خلاصهٔ آن عبارت از این بود که چون عرصهٔ قصر و زهاب و سایر از شر شقاوت اشرار احمدوند از امنیت افتاده بود برای حفظ امنیت و رفاه طرق و صفحات حدودیه خودمان جوانمیر و اتباع او را به یک مبلغی مخارج نگاهداری و حقوق مزبوره را وقایه نموده‌ایم و تا تحصیل سند تأمین رسمی از باب عالی به حفظ حالت حاضره ناگزیریم و مکرر سند رسمی خواستیم که ما را اطمینان بدهند همین که جوانمیر و اتباع او از این طرف دفع و طرد شدند آنها را محو و قمع یا به ولایات دورتر از سرحد تبعید خواهند و اولی خواهد بود.

زیرا که از جهت پولتیک شخص جوانمیر اهمیت ندارد ولی تجاوزات متمادیه و شقاوت‌های مستمرهٔ او و اتباع او است که رفته رفته فی‌مابین دولتین امروز رنگ دیگر پیدا کرده که وکلای عظام دولت علیهٔ عثمانیه بکلی از امن و آسایش حدود مأیوس شده‌اند. و از جهت حقوق اگر مرقومین طرد نشوند جرایم و جنایات آنها بلامجازات می‌ماند و مظلومین و متهومین از مدعیان او در دعاوی خودشان باقی و غیر متسلی می‌مانند و حقاً احتمال می‌دهند که لدی‌الفرصه باز خودشان را به حدود و نقاطی رسانیده مجدداً مصدر شقاوت و شرارت شوند. آمدیم بر سر جهت فواید و آن این است که در صورت عدم طرد اشقیا و اشرار سایره طرفین تنبیه و آسوده نمی‌شوند و خاک یکدیگر را برای خودشان ملجأ و پناه دانسته هر روز مرتکب شقاوت و شرارت خواهند بود.

و در تبعید تنها امنیت مؤقر حدود خواهد بود و بس حالا وقت است که عدل و نصفت و حقوق‌شناسی و عهدداری را در میانه حاکم کرده هر یک که مرجع و موجب ازدیاد سلم و صفوت دولتین علیتین اسلام و سبب مزید امنیت و انتظام حدود جانبین است. اولیای فخام دولت علیه ایران اختیار فرمایند که مسئله از میانه برداشته شود. زیاده زحمت است. فی ۱۳ ربیع ثانی سنه ۱۳۰۴

مُهر: خلیل خالد

**شماره سند: ۷۳**
**موضوع: تبعید جوانمیر احمدوند**
**تاریخ: ۱۳ ربیع الثانی ۱۳۰٤ هـ.ق**
[گزیده اسناد سیاسی ایران و عثمانی، ج ۲، ۷۰۰]

### نامهٔ سفارت عثمانی در طهران به وزارت خارجه

جناب مستطاب اشرف امجد ارفعا دوستان استظهارا مشفقا معظما مهربانا

مراسلهٔ محترمهٔ جناب مستطاب اشرف عالی مورخهٔ ۱۱ شهر ربیع الثانی سنهٔ ۱۳۰٤ نمرهٔ ۱۱۳ دایر به فقراتی که میان دوستدار و جناب مستطاب اشرف یوم چهارشنبه دهم شهر مزبوره در باب جوانمیر شقی شریر و اتباعش مذاکره شده است واصل اتامل احترام گردیده و تکرار می کند که بلی دوستدار اظهار داشتم که دولت علیهٔ متبوعهٔ دوستدار در مطالبهٔ طرد اشقیای تبعهٔ خود سند نمی دهد و می باید جوانمیر و اتباعش را طرد و تسلیم نمود و یا از حدود و آن حوالی تبعید کرد، ولی شق اول مختار و مطلوب باب عالی است، و شق ثانی محض تسهیل امر رأی و خیال دوستدار بود و اگر شقین مزبورین را در میزان حق و عدل بیاوریم و جهات پولتیکی و حقوق و فواید آن را ملاحظه کنیم، البته مطلوب باب عالی ارجح کرد و بعد از این و آن خسارت‌های مکرر و زحمت های متوالی تجدید نخواهد شد و خلاصهٔ جواب آن جناب جلالت مآب هم چنین شد که باب عالی هرگز از بابت امثال جوانمیر شریر شقی سند نمی دهد اما هر وقت اطلاع دادید که حاضر می شوید برای طرد او فوراً ما هم حاضر هستیم برای اخذ و نفی و تبعید او و اگر می خواهید به هیچ وجه معترض او نشده ابداً اظهاری نکنیم او را به داخلهٔ خودتان مثل اصفهان و امثال آن تبعید نمایید ما ابداً حرفی نخواهیم داشت چون برای ختم کلام می خواهم مراتب را به عرض خاک پای معدلت پیرای همایونی روحنافداه برسانم اگر حاصل مذاکرات جاریه به همین قرار است ملاحظه و مرقوم فرمایید تا عرض شود. زیاده زحمت نمی دهم.

(محل امضاء)

شمارهٔ سند: ۷٤
موضوع: تظلم احمدوندها
تاریخ: (احتمالاً ۱۳۰٤ هـ.ق)
[گزیدهٔ اسناد سیاسی ایران و عثمانی ج ۲،۲-۳۰۷]

## نامهٔ صدراعظم (امین‌السلطان) به حاکم کرمانشاه

هو

جواب تلگراف رمز حسام‌الملک رمز شود.

تلگراف جناب عالی رسید از ملاحظهٔ همایونی گذشت می‌فرمایند: اولاً در باب اسرای احمدوند آنچه تا به حال داده شده‌است کافی است بعد از این یک نفر ندهید و هرچه هست جمع نموده با پسر جوانمیر در کرمانشاهان پیش خودتان نگاه دارید دانسته دیگر یک نفر ندهید که لازم نیست ثانیاً، در باب تظلم احمدوندها به باب عالی و اصرار والی موصل در این که آنها را در میان سلیمانیه و موصل جا بدهید اطلاع حاصل شد خیلی مشکل است که این حرف را دولت عثمانی قبول کرده باشد ولی آنچه لازم است در این باب هم در اسلامبول هم در طهران باسفارت گفتگو خواهد شد و به شما هم اطلاع داده خواهد شد شما هم همواره در اردوها و موصل و غیره جاسوس داشته باشید و از این قبیل اخبارات هرچه باشد زود به زود اطلاع بدهید که لازم است.

امین‌السلطان

سەری جوامێرئاغا و هاوڕێکانی

**قەلاّی جوامێرئاغا لەقەسری شیرین**

**ساڵی ١٩٠١.ز**

**شوێنەواری قەڵای جوامێر لەقەسری شیرین**

**لای ڕاست (عباس حسین ئەسکەندەر هەمەوەندی دانیشتووی قەسری شیرین )**

**لای چەپ (لیوا محمد سابیر سلێمان هەمەوەندی دانیشتووی چەمچەماڵ )**

**ئەم وێنەیە لەڕێکەوتی ٢٦ / ٨ / ٢٠٠٦ زاینی گیراوە**

ملک نیاز خان سرتیپ فوج گوران کرندی

شاهمراد خان سەرۆك خێڵی ئەحمدوەند بهتوی (سرتیپ)

**وێنەی خێڕولاّخانی سەرۆك خێلّ ئەحمەدوەند(بهتۆیی)**

**مەحموود پاشای جاف**

**١٨٤٦.ز – ١٩٢١.ز**

**باڕۆن ئیدوارد نۆڵد**

**١٨٤٩ز – ١٨٩٥ ز**

# سوپاس

* زۆر سوپاسی بەڕێز کاك دارا ئەحمەد بەگی کەریم بەگ هەمەوەند دەکەین ، کە کتێبخانەکەی خۆی خستە ژێر دەستمان و گەلێك پەرتوکی مێژوویی و سەرچاوەی بۆ پەیدا کردین ، خۆشی کەسێکی مێژوو دۆستە .

* زۆر سوپاسی بەڕێزان مامۆستا محمد سعید نەجاری (ئاسۆ) و ئەمیر کەریم نەژاد دەکەین ، کەتوانییان جوامێر نامە و فەتحنامەی حسام الملك وەربگێڕن بۆ سەر زمانی کوردی .

* سوپاس و پێزانینمان بۆ خاوەنی چاپخانەی کوردستان کاك عەباس غەفور هەمەوەندی کە هاوکاری کردین بۆ لەچاپدانی ئەم کتێبە .

## سەرچاوەکان


١. مامۆستا عەلاددین سوجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی نەجاح ، بەغدا ، ساڵی ١٩٥٢.ز .

٢. عەبدولرەقیب یوسف ، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی ، سلێمانی ، ساڵی ١٩٩٧.ز ، ژمارە ٢٤٦ .

٣. ئۆ. ل . ڤیلچیڤسکی( ڕەشاد میران لەڕووسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر کوردی ) ، کتێبی نەژادی کورد ڕەوتی مێژوویی دروست بوونی میللەتی کورد ، هەولێر ، چاپی دووەم ، ساڵی ٢٠٠٠.ز .

٤. جەمال بابان ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، بەغدا ، حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٧.ز ، ژمارە ١١٤.

٥. مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عەبدولکەریم ، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ، لە چاپ کراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٠.ز .

٦. الکاتب الصحفي أحمدتاج الدين ، الأکراد تاريخ شعب و قضية وطن ، القاهرة ، سنة ٢٠٠١ م .

٧. حەیدەر بهتۆیی ، کتێبی کورد و پراگندگی او درگستره ایران زمین ، تاران ، ١٣٧٧ی هەتاوی .

٨. حەسەن فەهمی بەگی جاف ، مێژووی هۆزی جاف و مەحموود پاشای جاف ، ئومێد ئاشنا پێشەکی بۆ نووسیوە و چاپی کردووە ، بەغدا ، ساڵێ ١٩٩٩.ز .

٩. محمد سعید سلیم جاف ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، بەغدا ، ساڵی ١٩٧٨.ز ، ژمارە٧١ .

١٠. کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف ، تەئریخی جاف ، بەغدا ، ساڵی١٩٩٥.ز

١١. عەبدولرەقیب یوسف ، گۆڤاری هەزار مێرد ، سلێمانی ، کانوونی یەکەمی ساڵێ ١٩٩٩.ز ، ژمارە ١٠ .

١٢. مامۆســتا ڕەســولْ هــاوار ، كتێبــی شــێخ مــەحموودی قارەمــان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، لەندەن ، ساڵی ١٩٩١.ز ، لاپەڕە ٨٣٥ .
١٣. دکتــۆر عەبــدوڵا عــەلیاوەیی ، کوردســتان لــە ســەردەمی دەوڵــەتی عوسمانیدا ، سلێمانی ، چاپی یەکەم ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٤.ز .
١٤. نەریمان سوبحانی ، کتێبی شهر باستانی قەسر شیرین ، کرماشان ، ساڵی ١٣٨٠ ی هەتاوی .
١٥. کتێبی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵای نەهریْ لە بەڵگەنامەکانی فەڕەنسیدا ســاڵی ١٨٧٩– ١٨٨٢ . ز نــەجاتی عەبــدوڵا لەفەڕنــسییەوە کردوویــەتی بەکوردی ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٤.ز .
١٦. دەست نووسەکەی حەیدەر عەزیز خەسرەو ئاغای هەمەوەند .
١٧. محمــد ئــەمین زەکــی بــەگ ، تــاریخی ســلێمانی و وڵــاتی ، چــاپخانەی نەجاح ، بەغدا ، ساڵی ١٩٣٩.ز .
١٨. دکتۆر حەسەن جاف ، گۆڤاری ڕۆشنبیری نویْ ، بەغدا ، کانونی یەکەم ساڵی ١٩٨٧.ز ، ژمارە ١١٦.
١٩. محمــد حەمــە بــاقی ، کتێبــی شۆڕشــی شــێخ عوبەیــدوڵای نــەهریْ لەبەڵگەنامەی قاجاریدانووسینی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ساڵی٢٠٠٠.ز .
٢٠. محەمــەد عــەلی ســوڵتانی ، ٢/٢ ایــلات و طوایــف کرماشــاهان ، تــاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز .
٢١. سەرتیپ هەمەوەنــدی ، گۆڤــاری کــەرکوك ژمــارە ٢٧ ، کــەرکوك ، ساڵی ٢٠٠٦.ز .
٢٢. محەمــەد عــەلی ســوڵتانی ، ٢/١ ایــلات و طوایــف کرماشــاهان ، تــاران ، ساڵی ١٩٩٣.ز .

٢٣. میرزا احمد ایلهامی ، فەتحنامەی حسام الملك ، بانظمام محاربات ملك نیاز خان و جوانمیرد هماوند از درویش قولی کرندی ، باهتمام محمد علی سلتانی ، تاران ، ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی .
٢٤. تۆفیق وەهبی ، ( ئەحمەد ڕێبوار وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ) ، گۆڤاری ڕامان ژمارە ٥٥ ، گەشتی ملەی تاسلوجە ، هەولێر ، کانونی دووەم ساڵی ٢٠٠١.ز .
٢٥. دکتۆر احسان فواد ، گۆڤاری ڕەنگین ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٨.ز ، ژمارە ٣ .
٢٦. باڕۆن ئیدوارد نۆڵد (وەرگێڕانی دکتۆر حەمید عەزیز) گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ساڵی ٢٠٠٤.ز .
٢٧. کەریم سنجابی ، خاطرات علی اکبرخان سنجابی ، ایل سنجابی و مجاهدات ملی ایران ، تهران ، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی .
٢٨. سدیق ساڵەح ، بەسەر هاتووی کاکە ڕەشید شەوقی ، بنکەی ژین ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٣.ز .
٢٩. عەلی سەیدۆ گەورانی ، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە تالیب بەرزنجی ، لەعەممانەوە بۆ ئامێدی گەشتێك بە کوردستانی باشوردا ، سلێمانی ، ساڵی ٢٠٠٠.ز .
٣٠. نەقیب عەبدوڵا ، جوامێر ئاغای ڕەنگینە ، سلێمانی ، ساڵی٢٠٠٤.ز .
٣١. مەسعود محەمەد ، حەمەئاغای گەورە ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٦.ز .